# جەژنی قوربان و جەنگی قەڵاتوکان

٢٤ / ٧ / ١٩٨٨

علی باپیر

چاپی یەکەم

١٤٤١ک - ٢٠٢٠ز

بسم الله الرحمن الرحيم

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ
هَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ
أُوْلَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ
غَفُورٞ رَّحِيمٞ 

سورة البقرة - ٢١٨

# پێشکەش بێ

بە هەموو ئەو برا و خوشکە لە خۆبوردوو و فیداکارانەی بە تاسە و تین و تاوەوە، لەسەنگەری بەرگریی لێکردنی ئیسلام و، بەرهەڵستیی کردنی کوفر و ستەم دا، بە شێوەیەك لە شێوەکان، ڕۆڵیان گێڕاوە، لە کوردستان و هەر جێیەکی دیکەی جیهانی ئیسلام دا، چونکە بە دڵنیایی: زیندوویێتی ئیسلام و، بە پێوەمانەوەی، پەیوەستە بە هەبوونی کەسانێکی خەباتگێڕی دامەزراو و نەلەخشاوەوە.

# پێشدەستیی [١]

کاتێك مرۆڤ ئاوڕ لە مێژوویەکی پڕ لە سەروەریی دەداتەوە و، لاپەڕەکانی موتاڵا دەکاتەوە، باشتر دەزانێ: چەند ئازار و کوێرەوەریی چەشتوە و، چ خوێن و ئارەقەیەکی ڕشتوە و، چۆن و بە چ دەردەسەرییەك، بە ئەمڕۆ گەیشتوە و، ئێستاش ڕێبواری کام کاروانە و،  چ ئەرکێکی لەسەر شانە و، وەفاداریی و بەردەوامییشی، چەند لێ جوانە؟!

بۆیە لەم سۆنگەیەوە، ئەم بەرهەمەی بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر(جەژنی قوربان و جەنگی قەڵاتووکان) - کە لە ئەسڵدا وتارێکە و لە ١٩٨٨/٧/٢٤، بەبۆنەی داستانی قەڵاتووکان و شەهیدانی گردی ڕەمکان و جەژنی قوربانەوە، لە ناوچەی بەستەمەلەی بناری قەندیل، پێشکەش بە پێشمەرگەکانی هێزی حەمزە و ڕای گشتیی کراوە- یەکێك لەو سەروەرییانەمان بیردەخاتەوە و، بۆ نێو دیمەنە حەماسەسازێنەکانی ئەودەممان دەباتەوە و، پێمان دەڵێ: ئاوا گەیشتووینە ئێرە!

بەڵێ ئەم بەرهەمە: کە پەیوەستە بە داستان و قۆناغێکی سەختی کاروانی ڕابوونی ئیسلامیی کوردستان و، خەباتی ڕزگارییخوازییمان و، لە کەشێکی پڕ لە حەماسەت و قوربانییدان و، کرداریی و مەیدانی تێکۆشان دا، چاوی هەڵێناوە و بە خوێن نەخشاوە، بایەخی تایبەتیی هەیە و، تام و چێژێکی نایاب، هەستێکی قوڵ

---

(١) - بەندە، ئەم پێشدەستییەم لەسەر ڕاسپاردەی بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر نووسی، ئەمەش لەو سۆنگەیەوە کە یەکێك بووم لە پێشمەرگە و هاوڕێیانی ئەو ڕۆژە سەختانە و، هەروەها تۆزێکیش لەگەڵ ئەم بەرهەمەی بەڕێزیان دا، سەروکارم هەبووە، هەروەك ڕاشی سپاردم کە شیعرێك و کۆمەڵێك وێنەی پەیوەست بەو قۆناغەوە، لە پاشکۆی ئەم بەرهەمەی بەڕێزیاندا دابنێم، بۆیە زۆر سوپاسی ئەو ڕێز و حورمەتەی دەکەم.

و غوربەتێکی تەواو و ورە و هیوا، بە مرۆڤ دەبەخشێت و، وانەی کۆڵنەدان و پەیامی شەهیدان، بۆ نەوەی نوێ و ئێستا و ئایندە دەڵێتەوە!

سوپاس بۆ خوا، بەندە بەش بە حاڵی خۆم، هەمیشە بەو بایەخەوە لەو ڕابردوە پڕ لە سەروەرییەم ڕوانیوە و دەڕوانم و، هێندەی بۆم لوابێ و بتوانم، بە ئەرکی سەرشانی خۆم زانیوە و دەزانم، لە پاراستن و ڕانواندنەوەی، بە مەبەستی پەند و ئیلهام لێوەرگرتن و سەرلەنوێ خوێندنەوەی، بەشداربم و سوپاس بۆ خوا بەشداریش بووم .[1]

ئێستاش خۆشحاڵم لەم بەرهەمەی بەڕێز (مامۆستا عەلی باپیر)یشدا، شتێکم پێ براوە و، دەبینم بەرهەمێکی دیکەی پەیوەست بە سەروەرییەکان، بەوشێوە چاپ و بڵاودەبێتەوە و دەکەوێتە بەرچاوی خوێنەرانی بەڕێز.

لە کۆتاییدا لە خوای میهرەبان دەپاڕێمەوە، ئەو خوێن و خەبات و ڕەنج و ماندووبوون و کوێرەوەریی و گیانفیدایی و هیجرەت و جیهادە، لە هەموولایەك قبوڵ بکات و، هێز و وزە و توێشووی بەردەوامیی و بڕینی ڕێگامان پێ بدات و، بەسەر کۆسپ و لەمپەر و پیلانەکاندا سەرمان بخات و، بەرەکەت و پیت و پێز و وزە و هێزی زیاتریش بخاتە نێو خەرمانی خزمەت و تێکۆشانی بێ وچان و، تەمەن و ژیان و، توانا و فکر و قەڵەمی مامۆستای تێکۆشەر و ڕووناکبیرەوە.

شەریف وەرزێر
٢٠٢٠/١/١٩
ڕانیە

(١) بێجگە لە چەند بەرهەمێك کە لەو بارەوە خستوومنە بەردەستی خوێنەران، بە یارمەتی خوای پەروەردگار، لەبارەی هێزی حەمزە و کۆمەڵێك بابەتی دیکەی پەیوەست بەم کاروانەش، بەرهەمێکم بەدەستەوەیە و کەم و زۆر کارم لەسەر کردوە.

# پێشەكی

إنَّ الْحَمْدَ لِلهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللهِ مِنْ شُرُورِ أنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلاَ هَادِىَ لَهُ، وَأشْهَدُ أنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأشْهَدُ أنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ

{يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ }(آل عمران:١٠٢)

{يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا } (النساء:١)

{يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا }(الأحزاب: ٧٠، ٧١)

أمَّا بَعْدُ:

فَإِنَّ خَيْرَ الْحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ، وَخَيْرَ الْهَدْيِ هَدْيُ مُحَمَّدٍ صلى الله عليه وآله وسلم، وَشَرَّ الأمُورِ مُحْدَثَاتُهَا، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّارِ.

خوێنەری بەڕێز و سەنگین!

ئەم نامیلکەیەی بەردەستت، لە ئەسڵدا وتارێکی بەندە بووە، بەناوی (**جەژنی قوربان و جەنگی قەڵاتووکان**) کە لە (بەستەمەلە)[١] لە ڕۆژی (١٠/ ذیلحجة/ ١٤٠٨ ك - ١٩٨٨/٧/٢٤ز)دا دراوە، بەبۆنەی داستانەکە و جەژنی قوربانیشەوە، دوو ڕۆژ دوای داستان و ڕووبەڕووبوونەوەکەی سەر (گردی ڕەمکان)[٢]ی نزیك گوندی (قەڵاتووکان)[٣] و شوێنەکانی دیکە.

زۆریش سوپاسی برای دڵسۆزم کاك (شەریف وەرزێـر) دەکەم کە ئەرکی هێنانەسەر کاغەز و تایپکردن و ڕێکخستنی کێشاوە و ژمارەیەك پەراوێزیشی بۆ نووسیون،[٤] کە تیشکی زیاتر دەخەنە سەر هەندێك لە بڕگەو تەعبیرەکانی وتارەکە.

بە پێویستیشی دەزانم لەم پێشەکیەدا ئەگەر زۆر بە کورتییش بێ، ئاماژە بە چەند خاڵێك بکەم، کە سەرجەم دە (١٠) خاڵن:

---

(١) شوێنێکە لە بناری قەندیل، دەکەوێتە پشت گوندەکانی ئاشقوڵکە و سوورەدێ، مانگی ٥ی ١٩٨٨، ئەو بنکەیەی هێزی حەمزە کە لە مانگی ٤ی هەمانساڵ لە کوڕکی کاوی دانرابوو، گواسترایەوە بۆ وێ و، مامۆستا حسن بابکر کە ماڵەکەشی لە قەڵاتووکانەوە گواستبۆوە بۆ بەستەمەلە، لێپرسراوی بوو.

(٢) گردێکی گەورەی بەرزە، دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی گوندی قەڵاتووکانەوە و بەسەر دیوی ڕەزگە و قەڵاتووکان و دەوروبەریان دا دەڕوانێ و شوێنێکی زۆر گرنگ و ستراتیژییە و بە کلیلی بەشێکی زۆری ئەو ناوچەیە دادەنرێ و، بە گرتنی وێ، ئەو ناوچەیە کۆتڕۆڵ دەکرێ.

(٣) گوندێکە دەکەوێتە دامێن چیای سەرکەشی گەڵاڵە لە زنجیرە چیای (قەندیل) و، لە باکووری ڕۆژئاوای گردی ڕەمکان و ڕۆژئاوای گوندەکانی (ڕەزگە)و )مارەدوو)ەیەو، سەر بە ناحیەی سەنگەسەرە.

(٤) هەندێك لە پەڕاوێزەکانیش هی بەندەن، ئنجا بۆ لەیەك جیاکردنەوەیان بۆ ئەوانەی خۆم -کە کەمترن- لەکۆتاییان دا (ع.ب) دەنووسم، کە زۆربەیان ڕوونکردنەوەی مانای هەندێك وشەو تەعبیرن.

یەكەم: ئەم وتارە هەڵقوڵاوی نێو جەرگەی خەبات و بەرخۆدان و فیداكاریی و، دەرهاویشتەی واقیعێكی یەكجار سەخت و دژوارە و، پاش شەڕێكی گەرم و خوێناویی دراوە، كە چوار برای هەڵكەوتووی تێدا كوژراون - خوا بە شەهیدی وەرگرتبن - و ژمارەیەكیش بریندار، بۆیە زمان و تەعبیری بێژرانەكەی دڵگەرمیی و حەماسەت و تووڕەییەكی بەرچاوی پێوە دیارە و، لە حاڵەتی واشدا هەر وتاری وا دەدرێ!

وێڕای ئەوەی كە زیاتر لە سی و یەك (٣١)ساڵ بەسەر ئەوكاتەدا تێپەڕیوە كە وتارەكەی تێدا دراوە و، پێویستە ئەوەش لەبەرچاو بگیرێ.

دووەم: ئێمە ئەو وتارەمان وەك خۆی هێشتۆتەوە و، تەنیا چەند وردە دەستكاریی چەند وشە و تەعبیرێك كراوە، كە زمانی نووسین دەیخوازێ و، كەم كەمەش وشەی زیادی - كە زمانی وتاردان خواستوونی - تێیدا لابراون.

سێیەم: هەندێك وشەش كە زانرابێ بۆ بەشێك یان زۆرێك لە خوێنەران نامۆن، لە پەڕاوێزدا، چەمك و واتایان ڕوون كراوەتەوە، چ لەلایەن خۆمەوە یان كاك شەریف وەرزێرەوە، دوای بینینەوەی خۆم.

چوارەم: ئەم وتارە لەلایەن ڕاگەیاندنی هێزی حەمزەوە، تۆمار كراوە و دەستاودەستی پێكراوە و ماوەتەوە، بۆیە شایستەیە سوپاسی سەرجەم ئەو برا بەڕێز و دڵسۆزانەی ڕاگەیاندنی ئەوسای هێزی حەمزە بكەم و، داوای پاداشتی بەرز و ناوازەی خوای بەخشەریان بۆ بكەم، بە تایبەت هەردووك برای دڵسۆز و وەفادار: كاك (تەها حاجی ظاهیر)و كاك (عبدالكریم قادر خدرە سوور)، كە لە بواری وێنەگرتن و تۆماركردن (تسجیل) دا خزمەتێكی بەرچاویان كردوە و، ئەرشیفێكی دەوڵەمەندیان بۆ بەرهەم هێناوین و،

ئەوان زۆربەی هەرە زۆری وێنە و وتارەکانی ئەوکاتیان تۆمارکردون و پاراستوون.

پێنجەم: شایانی باسیشە (هێزی حەمزە)[١]ی ئەوساکە - کە لە کۆتایی مانگی شەش (٦)ی (١٩٨٧ز)دا دامەزراوە و، لە: (١٩٨٧/٨/٢٠ ز)دا بنکە و بارەگای لە قەڵاتووکان و پاشان (بەری ئەبووبەکرە و بەستەمەلە) کردوونەوە – وێڕای کار و چالاکی پێشمەرگایەتی و جەولە و گەڕان و سەردان و چەند جارێك ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ڕژێم و چەکدارەکانی دا، مشوورێکی باشیشی دەخوارد لە ڕووی: ڕاگەیاندن و بانگەواز و کاری سیاسیی و دیبلۆماسیی و پەروەردە و...هتدیشەوە، کە بەرهەمە چاپکراو و تۆمارکراوەکانی، وێڕای نێوخۆی (بزووتنەوە)و بنکە و بارەگایەکانی هێزەکانی، دەنێررانەوە نێو شارەکانیش و لە پانتاییەکی فراوانی ڕێکخستنەکانی نێوخۆ (التنظيمات الداخلية)دا دەستاودەستیان دەکرد، لە هەردووك پارێزگای سلێمانیی و هەولێر و قەزا و ناحیە و گوندەکانیان دا بەگشتی و لە دەڤەری (بیتوێن - پشدەر)دا بەتایبەت و، سەرەنجام هۆکاری هۆشیاریی و بێداریی و بەرچاوڕوونیی بوون بۆ خەڵکێکی باش و، ئێستاش لەگەڵ بێ، لە زۆر کۆڕ و مەجلیسان دا باسی ئەو بەرهەمە چاپکراو و تۆمارکراوانە دەکرێ، کە چ

---

(١) ئەم هێزە، دوای ئەوەی بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر لە مانگی ٦ی ١٩٨٧ دا سەردانێکی سەرکردایەتی و مامۆستایان دەکات لە شاری سنە و لەگەڵیاندا کۆدەبێتەوە و گفتوگۆ دەکەن، دادەمەزرێنرێ ، ئنجا دەکەوێتە مشووری دانانی بنکە و بارەگاکانی لەسەر خاکی ئازاد کراو، ئەوەبوو لە ١٩٨٧/٨/٢٠ یەکەم بارەگای لە قەڵاتووکان کردەوە و پاشان پەلی هاویشت بۆ دەوروبەر و سنوورەکە بە گشتیی و، سەرەنجام ئەم هێزە، بە فەرماندەیی مامۆستا عەلی باپیر، کە هەم ئەندامی سەرکردایەتییش بوو، لەسەرجەم بوارەکاندا بوو بە پێشەنگ و ڕۆڵی زۆر گەورە و کاریگەری بینی

کاریگەرییەکی گەورەیان هەبووە.

شەشەم: لێرەشەوە پڕ بەدڵ لە خوای بەخشەری بەبەزەیی دەپاڕێمەوە، کە بە باشترین شێوە پاداشتی تێکڕای ئەو برا پێشمەرگانەی ئەوساکە و، ماڵ و خێزان و کەس و کاریان بداتەوە و[1]، هەر سەربەرز و سەلامەت بن و، ئەوانەشیان کە لە ژیان دا نەماون، خوا بە بەهەشتیان شاد بکات و پلەوپایەیان بەرز بکاتەوە.

بەتایبەت بۆ هەرچوار برای شەهید و، باب و دایك و خزم و کەس و کاریان، لە خوای میهرەبان داوادارم لە پاداشتی نەبڕاوەی خۆی لە بەهەشتە ڕازاوەکانی دا، شادمان و بەختەوەریان بکات.

حەوتەم: هەروەها لە خوای بەخشندە و بەخشەر داواکارم بە باشترین شێوە پاداشتی ئەو برا کاروانچییانەمان بداتەوە، کە ئەوکاتە بە ئێستر و وڵاخەکانیان، وێڕای زاد و زەخیرە و کەل و پەلی ماڵ و بنکە، زۆرجاران فیشەك و تەقەمەنییشیان بۆ دەهێناین و، ڕۆڵیان ئەگەر زیاتر نەبووبێ - بەتایبەت هەندێکیان - لە هی پێشمەرگەکان کەمتر نەبوو.

---

(١) دیارە لەنێو ئەو پێشمەرگانەدا بەشێکیان کە خێزاندار، یاخود لەگەڵ ماڵی باوکیاندا بوون، بە ماڵەوە هیجرەتیان کردبوو، ئەوانەشی ئەوکات دوای دانانی بنکە و بارەگاکانی هێز، بەماڵەوە لە قەڵاتووکان بوون، بریتی بوون لە: (مامۆستا عەلی باپیر، مامۆستا حسن بابکر، مەلا ئەحمەدی هەنارۆکی، محمد حاجی عەلی (بیلال بۆسکێنی)و دواتریش لە مانگی ٦ی ١٩٨٨ ئومێد بۆسکێنی - ش کە خۆی پێشتر هاتبوو و، هەروەها دوای ئەویش کاك سۆرکان حمد - ی ڕەحمەتی، ماڵیان هێنا بۆ قەڵاتووکان. شایانی باسە، دوای کشانەوەمان لە قەڵاتووکان و چوونمان بۆ کوێستانی (مالەخ)ی قەندیل و دەوروبەری، خێزانەکانی هەرکام لە: (مامۆستا شەریفی شەهید و مامۆستا سەید عبداللەی لۆتەری و کاك عبدالصمد احمد و کاك عبدالله بایز) لە داخلەوە هاتبوون و دوای ماوەیەك بەگشتی چوونە ئەودیو و لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان نیشتەجێ بوون.

هەشتەم: دیسان ئەو خەڵکەش کە ئەوکاتە لەو گوندانەی: قەڵاتووکان، ئەبووبەکرە، دیوی ڕەزگە، سوورەدێ، ئاشقوڵکە، پشتاشان،... بوون، هەروەها ئەوانەی لە کەشی بەهار و هاوین دا دەهاتنە کوێستان بۆ هەوارگەکانی قەندیل، کە گەلێك جار میواندارییان دەکردین و ئەرکیان پێوە دەکێشاین، خوا پاداشتی هەموولایەکیان بداتەوە و، ئومێدم وایە ئەو خزمەتەیان، چ بۆ ئێمە و چ بۆ خەڵکی دیکەش، پارسەنگێکی باش بێ لە تەرازووی خێر و چاکەکانیاندا.

نۆیەم: هەروەها ڕێکخستنەکانیش شایستەی دەستخۆشیی و ڕێز و پێزانین و بۆ پاڕانەوەی باشن، خوا بە لوتف و بەخششی بێ سنووری خۆی مامەڵەیان لەگەڵدا بکات و، ئەوەی کردوویانە لەوکاتە سەغڵەت و دژوارەدا (ساعة العُسْرة)دا بیکاتە توێشووی قیامەتیان، چونکە ئەوکاتە ئاشکرا (کشف) بوونی هەرکامێکیان، مایەی تێداچوونی خۆی و، گرفتاربوونی خزم و کەس و کاریشیی بوو، وەك بۆ چەند پۆلە برایەکمان لە (چوارقوڕنە)و (هەولێر) و (سلێمانیی) ڕوویدا و هەندێکیان وێڕای شوێنبزرکران و شەهیدکرانی خۆیان، کەس و کاریشیان گیرا، یان ماڵ و خانوویان تەخت و وێران کرا، لەلایەن ڕژێمی بەعسی سیکۆلاریست و ڕەگەزپەرستی تێداچووەوە.

دەیەم: لە کۆتایی دا دەڵێم:

بە پێی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ((صلى الله عليه وسلم) (مَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا من بَعده من غَير أَنْ ينْقُص مِنْ أُجُورِهِمْ شَئُ...) مسلم: ١٠١٧.

واتە: هەرکەس ڕێیەکی چاکە لە ئیسلام دا دابنێ، پاداشتی داهێنانەکەی و، هێندەی پاداشتی هەموو ئەوانەشی هەیە کە کاری پێدەکەن لەدوای وی،

بێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان کەم بکاتەوە...

منیش ئومێدم وایە هەموو ئەوانەی بەشێوەیەك لە شێوەکان لەو خەبات و تێکۆشان و فیداکارییەدا بەشداربوون، خوای بەبەزەیی و بەخششی بێ سنوور، وێڕای پاداشتی کارەکەی خۆیان، لە خێر و پاداشتی هەموو ئەوانەش دا بەشداریان بکات، کە دواتر بە کار و پرۆژەی ئیسلامیی و کاروانی دینداریيەوە پەیوەست بوون، چونکە بێگومان ئەو خەبات و بەرخۆدان و کۆچکردن و جەنگ و فیداکارییەی ئەوساکە، ڕۆڵێکی گرنگ و کاریگەری گێڕا لە هۆشیارکردنەوەی مسوڵمانان و قۆڵ هەڵماڵینییان لە کار و چالاکی ئیسلامیی بە هەموو پێکهاتەکانییەوە: بانگەواز، پـەروەردە، ڕێکخستن، ڕاگەیاندن، فەرمان بە پەسند و ڕێگریی لە ناپەسند، کاری سیاسیی، کاری خێرخوازیی...

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

**عەلی باپیر**

١٧ جمادي الثانية ١٤٤١ ك

٢٠٢٠/١/١٣ ز

هەولێر

**تێبینی:**

**ئەم وتارەی بەندە لەکەناڵی تایبەتی خۆم**

**لە یوتیوب بەو لینکە هەیە:**

https://youtu.be/ouVA8xlq8ec



# دەقی وتاری
# (جەژنی قوربان و جەنگی قەڵاتووکان)

ألله أكبر ألله أكبر ألله أكبر، ألله أكبر ألله أكبر ألله أكبر، ألله أكبر ألله أكبر ألله أكبر، ألله أكبر كبيراً، والحمد لله كثيراً و سبحان ألله بكرة و أصيلاً.

أللهم يا ربنا لك الحمد كما ينبغي لجلال وجهك و عظيم سلطانك

ألحمد لله الذي لايحمد على مكروهٍ سواه

أشهدوا أن لا إله إلاّ الله، وأشهدُ أنّ محمداً رسول الله

صلِّ اللهم و سلِّمْ على سيدنا و حبيبنا و قائدنا محمد، و آله الطيبين الطاهرين، و أصحابه الغُرِّ المجاهدين، و كل من تبعهم بصدق إلى يوم الدين.

أيها المؤمنون! يقول سبحانه و تعالى فى محكم كتابه (وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ) [١]

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ خوای پەروەردگاری کائینات، لێزمە و ڕێژنەی ڕەحمەت و بەزەیی خوا دابارێ بەسەر گیانی پاکی هەموو پێغەمبەراندا بە گشتی، بە تایبەتی پێغەمبەری پێشەوامان (محمد) (صلى الله عليه وسلم)و خزمانی و هاوەڵانی و شوێنکەوتووانی ڕاستەقینەی تاکو ڕۆژی دوایی.

(١) ال عمران - ١٣٩ .

مسوڵمانان! برایانی عەزیز و خۆشەویست! ئەمڕۆ ڕۆژێکی پیرۆزە لە مێژووی ئیسلامدا، ئەمڕۆ جێژنێکە بەناوی جێژنی قوربان، کە یادکردنەوەی قوربانی سەربڕینی پێغەمبەر(ئیبراهیم)ە، (علیه الصلاة والسلام) لە پێناوی خوا دا، ئەو (ئیبراهیم)ەی کە تاقە جگەرگۆشەیەکی هەبوو (ئیسماعیل) (علیه السلام)، بەڵام خوای کارزان بە مەبەستی تاقیکردنەوە، فەرمانی پێکرد کە دەبێ ئەی (ئیبراهیم) کە تۆ بەڕاستی بەندەی منی و دڵت بۆ من ساغ و یەکلابۆتەوە، دەبێ بتوانی تاقە جگەرگۆشەی خۆت لەپێناوی من دا بکەیە قوربانیی و سەری بڕی! ئیبراهیمی خەلیل (علیه الصلاة والسلام)یش بە (ئیسماعیل)ی کوڕی ڕاگەیاند و ئەویش بەرفەرمان بوو و گوتی: (يَٰٓأَبَتِ ٱفۡعَلۡ مَا تُؤۡمَرُۖ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ )[1]، ئەی بابەگیان! ئەوەی فەرمانت پێکراوە جێ بەجێی بکە، من ئینشائەڵڵا لە خۆڕاگران دەبم.

ئیماندار خۆڕاگرە بۆ بەرفەرمانیی خوا، ئنجا (فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ...)[2] کاتێك لەپەوڕوو (ئیسماعیل)ی خست و خەریکبوو کێردی بە ملیدا بێنێت، ( وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ١٠٤ قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ .....)[3] گوتمان: ئەی (ئیبراهیم)! ئەو وەحییەی کە لە خەوندا پێمان ڕاگەیاندبووی، تۆ فەرمانەکەت جێ بەجێ کرد، دوایی خوای کاربەجێ بەرانێکی نارده خوارەوە و کردیە بەڵاگێڕ و قوربانیی بۆ (ئیسماعیل).

بەڵام ئێمە لە ڕۆژێکیدا و لە کات و قۆناغێکدا جێژنی ئەمساڵ دەگێڕین، کە ئێمەش سوپاس بۆ خوا، قوربانیی ڕاستەقینەمان لە پێناوی خوادا داوە، چوار ڕۆڵەی

(١) الصافات - ١٠٢.

(٢) الصافات - ١٠٣.

(٣) الصافات - ١٠٤.

بە جەرگی ئیسلام، چوار پێشمەرگەی وا کە دۆست و دوژمن دان بە ئازایەتیی و جەرگ و دەمارياندا دێنێت، ئێمە کردمانن بە قوربانی لە پێناوی بەرزکردنەوەی ئیسلامدا، لە پێناوی بەرگرییکردن لە عیززەت و کەرامەتی ئیسلام و مسوڵمانان‌دا، بەڵێ ئێمە جەژنی قوربانی ئەمساڵمان ئیتتیفاق دەکا لەگەڵ قوربانییەکدا، کە وەبیرهێنانەوەی قوربانیی هاوەڵانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)و گەورە پیاوانی مێژووی ئیسلامە، ئنجا بەو بۆنەیەوە چەند خاڵێك دەخەینە ڕوو و بەو بۆنەیەوە وتارێك دەدەین بەناوی: (جێژنی قوربان و جەنگی قەڵاتووکان).

## خاڵی یەکەم:

لە ڕاستییدا ئینسانی ئیماندار و مسوڵمان، دەبێ ئامادەبێ خوێنی لەپێناوی خوادا بڕژێت، دەبێ ئامادەبێ بە ئارەق و بە خوێن، بەسەر و ماڵ، بە ئیسڕاحەت لێ تێکچوون، بە دەربەدەربوون، بە هەموو شتێك، سەری دینی خوا بەرزکاتەوە، سەری ئۆممەتی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بەرز ڕابگرێت.

## خاڵی دووەم:

ئێمە کە لەوجەنگەدا شوێنی خۆمان بەجێ هێشت و - بە ڕواڵەت - پاشەکشەمان کرد، ئایا لە ڕوانگەی ئیسلامەوە و لە ڕوانگەی ئینسانی بە ویژدانەوە، ئەوە چی دەگەیەنێت؟! ئایا ئەوە پێی دەگوترێت تێشکان و بەزین؟! وەك هێندێك کەس دەڵێن، ئایا کە ئێمە شەهید و بریندارمان بوون، ئەوە پێی دەگوترێ خۆبەهیلاکدان و سەری خۆ بەفەتارەتدان؟!

وەك هێندێکی دیکە بە پێچەوانەوە دەڵێن؟! دەڵێین: نەخێر! خوا وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێ:

(قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ)[1] دوای ئەوەی کە مسوڵمانەکان لە جەنگی ئوحود دا تێشکان و سەربەرەژوور ڕایانکرد، هەرچەندە پێغەمبەر بانگی دەکردن(علیه الصلاة والسلام) ئەو هاوەڵە بەرزانە ڕایانکرد، لەبەرئەوەی دەیانزانی کە مانەوەیان لە مەیدانی جەنگدا، تێداچوونێکی یەکجارییە و قەڵاچۆبوونە، وایان بە چاکزانی کە شوێنەکە بەجێ بهێڵن و چەنگ وەقایمە بدەن .[2]

بەڵێ بەموناسەبەتی جەنگی (ئوحود)ەوە خوای زانا دەفەرموێ: (قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ...) لەپێش ئێوەدا زۆرجار یاساکانی خوا، بەسەر میللەتاندا جاری بوون، جاری وابووە کۆمەڵی ئیماندار سەرکەوتوە و جاری واش هەبووە تێشکاوە، (فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ) بەزەویدا بڕۆن و موتاڵای مێژوو بکەن، (فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ) ئنجا سەرنج بدەن! بزانن ئەوانەی کە بەرەی ناهەق بوو ون، سەرەنجامیان چۆن بووە؟! -جەولەیەك و دوو جەولە مەرج نیە- مەرج سەرەنجام و عاقیبەتە، خواش دەفەرموێ: (...فَٱصْبِرْ ۖ إِنَّ ٱلْعَٰقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ )[3] واتە: خۆڕاگر بە، سەرەنجام لە گرەوی ئیمانداراندایە، دوایی خوا دەفەرموێ: (هَٰذَا

(١) ال عمران- ١٣٧ .

(٢) چەنگ وەقایمە بدەن: بچنە شوێنێکی قایم و مەحکەم . ع.ب.

(٣) هود: - ٤٩ .

بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ)[١] لە سەرنجدانی مێژوودا کە دەبینین کۆمەڵی ئیماندار، کۆمەڵی خوا هەمووده‌مێ سەرکەوتوو نەبووە، تێشکانیشی هەبووە، ئا لەوەدا ئامۆژگاریی و پەند هەیە بۆ پارێزکاران.

ئنجا خوا دڵی ئیمانداران دەداتەوە و مەڵحەمێکیش بە برینی دڵی ئێمە و هەرکەسێکی دیکەدا دێنێت، کە لەیەکێك لەو جەولانەدا کە لەگەڵ دوژمناندا دەیکات، تێدەشکێت، یاخود پاشەکشەی دەکات، دەفەرمووێ: (وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ ...) ئەوە کاتی خۆی خوا بە هاوەڵانی فەرموو، ئێستاش بە ئێمەی دەفەرمویٚ! سوپاس بۆخوا کە ئێمە لە حاڵ و مەقامێك داین، ئەو قسەیەی کە خوا کاتی خۆی لەگەڵ هاوەڵاندا کردوویەتی، ئێستا لەگەڵ ئێمەدا دەیکات، کاتی خۆی بە هاوەڵانی فەرموو (وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟) پێی فەرموون: خۆتان زەعیف پێشان مەدەن و با دڵتان غەم و پەژارەی تێدا نەبێ، لەبەرئەوە کە حەفتا(٧٠)تان لێ شەهید بوو ئەی هاوەڵان! لە جەنگی ئوحود دا و ناچاربوون مەیدان بەجێ بیهێڵن و پاشەکشە بکەن، ئێوە خۆتان بێ هێز نەبینە بەرچاو (وَلَا تَحْزَنُوا۟) غەم و ماتەمییش دامەگرن، (وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ) چۆن دەبێ ئێوە هەست بە تێشکانی دەروونیی بکەن، چۆن دەبێ هەست بە بێ هێزیی بکەن، لە حاڵێکدا کە هەر ئێوە لە هەموو کەس بەرزترن، بەمەرجێك ئیمانداری تەواوبن، بەمەرجێك بڕواداری ڕاستەقینە بن، هیچ کەسێك لای سەرەوەتان لێ ناگرێ.

دوایی دەفەرموێ: (إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ...) ئەگەر ئێوە برینێکتان تێ بوو- ئەی هاوەڵان! - حەفتا(٧٠)کەستان لێ شەهید

(١) ال عمران - ١٣٨ .

بوو- هەروەها ئەی مسوڵمانانی هێزی حەمزە لە بزووتنەوەی ئیسلامیی! - ئێوە چوارتان لێ شەهید بوون لە سەرگردی ڕەمکان- (إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ) ئێوە برینێکتان تێ بووە، ئازارێکتان پێگەیشتوە! (فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ...) ئەوە قەومی کافران، کافرانی سەردەمی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەوانیش برینیان تێ بووە، لە شەڕی بەدردا حەفتا(٧٠)یان لێ کوژرا و حەفتا(٧٠)شیان لێ بەدیل گیرا، هەروەها لە شەڕی قەڵاتووکانیشدا، ئەوە ڕژێم و بەکرێ گیراوەکانی، سێ چوار جار هێرش بکەن، هەمووجارێ لێیان کوژراوە، کە وەك هەواڵمان پێگەیشتوە، ژمارەی کوژراو و بریندارایان لە سەرجەمی ئەو جەنگانەدا کە کردوویانە لەگەڵ ئێمەدا، گەیشتۆتە (٤٠-٥٠) کەس، لە جاش و لە عەسکەر، سوپاس بۆ خوا کە زیانی ئێمە دەیەك - یەك لەسەر ده - ی زیانی وانیش نابێت: (إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ...) ئنجا خوا سوننەتێکی خۆیمان بۆ دەخاتەڕوو، یاسا و قانوونێکمان بۆ دەخاتەڕوو لە مێژووی مرۆڤایەتیی دا، دەفەرموێ: (...وَتِلْكَ ٱلْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ ٱلنَّاسِ...) ئەو ڕۆژانەش کە سەرکەوتن و ژێرکەوتنیان تێدایە، دەستاودەستیان پێدەکەین لەنێوان خەڵکیدا، جارێك بەرەی هەق سەردەکەوێت و جارێکیش بەرەی ناهەق سەردەکەوێت، بەڵام وەك گوتم: سەرەنجام و عاقیبەت لە گرەوی ئیمانداراندایە.

چونکە ئیماندار، ژیانی خۆی لە مردنێ دا دەبینێت، بەڵام جاش و عەسکەری خۆفرۆش و تاغووت پەرست، لە کاتێکدا لەگەڵ مردندا ڕووبەڕوو دەبێت، سپی دەبێ و هەڵدەبزڕکێت، وەك چەندان جار دیتومانن، بۆ وێنە: جارێك

بۆسەمان بۆدانان[١]، ئێمە یازدە(١١) كەس بووین، لە خوار گردی ڕەمكان كەمینمان بۆدانان، ئەوان بەسەدان دەژمێردران، كەمینێكی یازدە (١١) كەسیی، دوای ئەوەی كە لێمان كردنە تەقە، یەك نەدەگەیشتە یەكی، ئەو هەموو جاشگەلە! جاشی مەرگە و پشدەر و بیتوێنیان كۆكردبۆوە، بەڵام لەبەردەم هەڵمەت و هێرشی یازدە (١١) كەسدا، هیچی خۆی ڕانەگرت!

ئنجا خوای زانا و توانا دەفەرموێ: (...وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ...) یانی: بۆیە ئێمە ئەو جەنگەمان هێنایە پێش، بۆیە دەبێ جەنگ لە نێوان ئیمانداران و ستەمكاراندا هەبێت، بۆ؟ (...وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ...) بۆئەوەی خوا ئیماندارانی بۆ دەربكەون، هەڵبەتە خوا دەیانزانێ، دەیانناسێ، بەڵام با لە مەیدانی عەمەل و واقیعدا دەربكەوێ: كێ بڕواداری ڕاستەقینەیە و كێش دڵ لەرزیو و بەزیو و ترسنۆكە، كێ لە مردنێ دەترسێت و كێ مردن لە پێناوی خوادا بە شانازیی و بەختەوەریی دەزانێت؟! دەبێ دەربكەون، ئەوەش لە مەیدانی خەبات و جەنگدا دەردەكەوێ، لەكاتی ترس و تەماعدا، لەكاتی دژواریی و كاتی ناسك و ناڕەحەتدا، ئینسان خۆیشی بۆ دەردەكەوێ و خەڵكیش دەناسێت!

---

(١) ئەم بۆسەیە، بەسەرپەرشتی مامۆستا عەلی باپیر، ڕۆژی ١٩٨٨/٧/٢٠ واتە: سەرەتای شەڕەكە، لە دامێنی گردی ڕەمكانەوە بەدیوی (كانی گاتوان)دا خۆی خزاندە نێو هێزی دوژمنەوە و لێیدا و شكاندی، بەو پێیەی لە كتێبی بیرەوەرییەكانی مامۆستاشدا هاتوە، بریتی بوون لە: (مامۆستا عەلی باپیر، مامۆستا حسن بابكر، شەهید مامۆستا عبدالرحمن لۆتەریی، عوسمان عەلی وەتمان، محمد حسن موسڵاوی، رسوڵ محمد بەستەستێنی، عومەر باپیر، عبدالكریم قادر، شەهید عەلی دێرەیی، حاجی ڕزگار، كمال محمد بۆسكێنی).

هەروەها حیکمەت و سودێکی دیکەی جەنگ و جیهاد: (...وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ ...) وە بۆئەوەش کە هێندێك شەهیدتان تێدا هەڵبژێرێ، هێندێك ئینسانی دانستەتان لێ هەڵبژێرێ و بیانبات بۆ خزمەت خۆی، ئەوەش حیکمەتێکی دیکەی جیهادە، بەهۆی جیهاد و جەنگەوە نەبێت، ئینسان چۆن شەهید بێت، بەهۆی ئەوەوە نەبێ کە لەسەر خوا و لەسەر ئیسلام، لەسەر میللەتی ستەمدیدە و مەزڵووم جەنگ دەکەی، چۆن پلەی شەهادەتت بە نسیب دەبێت؟!

(...وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ...) خواش زۆردارانـی خۆش ناوێن، بۆیە دەبێ کۆمەڵێك هەبن کە بەرهەڵستی ستەم و خراپە بکەن.

بەڵێ بەڕێزان! کشانەوەی ئێمە لەشەڕی قەڵاتووکان و بەجێهێشتنی ئەو شوێنانەی لێیان بووین، لە ڕوانگەی قوڕئانەوە و لە ڕوانگەی هەرکەسێکی بەویژدانەوە، بە تێشکان لەقەڵەم نادرێت، بەڵکو - وەك دوایی باسی دەکەین - پێویست بوو کە هەر وابێت، چونکە ئێمە جیهاد لە شەوورۆژێکدا نابینین، شۆڕشکردن شەو و ڕۆژێك نیە و مەیدانی جیهادیش، تەنها گردی ڕەمکان و ناوچەی قەڵاتووکان نیە، جیهاد، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: (الجهادُ ماضٍ إلى يومِ القيامةِ)[1] جیهاد فەرزێکە تاکو ڕۆژی قیامەتێ درێژە دەکێشێت، مەیدانی جیهادیش نەك هەر هەموو کوردستانە، بەڵکو هەموو جیهانە!

---

(١) رواه أبوداود: ٢٥٣٢ عن أنس بن مالك.

## خاڵی سێیەم:

ئنجا بێینە سەر مەسەلەیەكی دیكە، ئەوانەی كە لەوجەنگەدا شەهید بوون، كە خوا دەفەرموێ: (...وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَآءَ...) یەكێك لە حیكمەت و سوودەكانیی جیهاد ئەوەیە: كە هەندێك شەهیدتان تێدا هەڵبژێرێ، ئێمە چوار شەهیدی بەڕێزمان دان:

یەكەمیان: مامۆستا عبدالرحمن لۆتەریی [1]

دووەمیان: كاك ئەحمەد سكتانیی [2]

(١) عبدالرحمن مەحمود سەعید ، ناسراو بە: (مامۆستا عبدالرحمن لۆتەریی) ساڵی ١٩٥٦ لە گوندی (لۆتەر)ی بەری مەرگەی سەر بە قەزای دوكان لەدایكبوە، هەردوو قۆناغی سەرەتایی و ناوەندی لە شارۆچكەی بنگرد تەواو كردوە، دواتر بۆ درێژەدان بەخوێندن چۆتە پەیمانگای مامۆستایان لە سلێمانی، پاشان بووە بە مامۆستای قوتابخانەی گوندەكەیان، ساڵی ١٩٧٩ خێزانی پێكەوەناوە، لە ١٩٨٧/٧/٢١ هیجرەتی كردوە و، دوای دانانی بنكە و بارەگاكانی هێزی (حەمزە) لە قەڵاتووكان، بووە بە ئەندامی هێز، یەكێك بوو لەو حەوت كەسەی بەشداریی تێكشكاندنی گەمارۆی سەری (گردی رەمكان)ی كرد لە ١٩٨٨/٧/٢٢، هەر لەو دژە هێرشەشدا شەهید بوو، هەر لەسەر (گردی رەمكان)یش لەگەڵ (كاك ئەحمەد شاسوار و كاك عومەر بۆسكێنی) دا بە خاك سپێردراوە.

(٢) ئەحمەد حەمەدئەمین عەبدوڵڵا سكتانی، ناسراو بە: ئەحمەد شاسوار، ساڵی (١٩٦٦) لە گەڕەكی (گڵنجان)ی شاری رانیە لە دایكبوە، سەرەتایی لە قوتابخانەی ئاكۆی سەرەتایی و ناوەندیشی لە ناوەندی (رانیە)ی كوڕان و شەشەمی ئامادەیی لە ئامادەیی هەڵكەوت لە شاری سلێمانی تەواوكردوە، پاشان لە (پەیمانگای تەكنیكی، بەشی یاریدەدەری پزیشكی) موسڵ وەرگیراوە، دوای ساڵێك دەوامی پەیمانگا، لە ١٩٨٧/٧/٢١ هیجرەتی كردوە و، دوای دانانی بنكە و بارەگاكانی هێزی (حەمزە) لە قەڵاتووكان، بووە بە ئەندامی هێز، یەكێك بوو لەو حەوت كەسەی بەشداریی تێكشكاندنی گەمارۆی سەر (گردی رەمكان)ی كرد لە ١٩٨٨/٧/٢٢ ، هەر لەو دژە هێرشەشدا شەهید بوو، هەر لەسەر (گردی رەمكان)یش لەگەڵ (مامۆستا عبدالرحمن لۆتەریی و كاك عومەر بۆسكێنی)دا بە خاك سپێردراوە.

سێیەمیان: کاك عومەر بۆسکێنی [١]

چوارەمیان: کاك طاهر مەمەنداوەیی. [٢]

هەروەها برینداریشمان بوون، ئەوەی برینەکەی زۆر بوو، (مامۆستا مەلاعەلی مەمك) بوو.

**کورتەیەك دەربارەی هەرکام لەو شەهیدانە باس دەکەین:**

**یەکەمیان: مامۆستا عبدالرحمن لۆتەریی:**

یەکێك لەو کەڵە پێشمەرگانەی کە لەیەکەمین ڕۆژی جیهادەوە لەگەڵ ئێمە وەدەرکەوت، مامۆستا عبدالرحمن، بەرجەستەکەری تەقوا و شەجاعەت و

(١) عومەر ئەحمەد خدر، ناسراو بە: عومەر بۆسکێنی، ساڵی ١٩٦٩ لە گوندی (بۆسکێن) لە دایکبوە، لە بۆسکێن نراوەتە بەرخوێندن، درێژەی بە خوێندن نەداوە و سەرقاڵی کارو کەسابەت بووە، ١٩٨٧ پەیوەندی کردوە و سەرەتای ١٩٨٨یش لە قەڵاتووکان بووە بە پێشمەرگە، لە داستانی قەڵاتووکان یەکێك بوو لەو پێشمەرگانەی لەسەر گردی ڕەمکان بوون، لە ١٩٨٨/٧/٢٢ لەگەڵ دەستپێکردنی دژە هێرەشەکەدا، لە قۆڵی خۆیەوە خۆی پێناگیرێ و بە (الله اکبر) لەسەنگەر دێتە دەرەوە و پەلامار دەباتە سەر دوژمن و شەهید دەبێ، هەر لەسەر (گردی رەمکان)یش لەگەڵ (مامۆستا عبدالرحمن لۆتەریی و کاك ئەحمەد شاسوار)دا بە خاك سپێردراوە.

(٢) تاهیر عەبدوڵڵا قادر، ناسراو بە (تاهیر مەمەنداوەیی) ساڵی ١٩٧٠ لە گوندی مەمەنداوەی بەری مەرگەی سەر بە شارۆچکەی بنگردی سەر بە قەزای دوکان لە دایکبوە، سەرەتایی لەقوتابخانەی گوندی قەرەتەپە و ناوەندیشی لە بنگرد و سەنگەسەر و قەڵادزێ تەواوکردوە، دواتر لەخانەی مامۆستایانی سلێمانی وەرگیراوە، بەڵام نەچوە، ساڵی ١٩٨٧ پەیوەندی بەڕێکخستنەوە کردوە، لە ١٩٨٨/٥/٢١ هیجرەتی کردوە و، لە هێزی حەمزە لە قەڵاتووکان بووە بە پێشمەرگە، لە داستانی قەڵاتووکان یەکێك بوو لەو پێشمەرگانەی لەسەر گردی ڕەمکان بوون، لە ١٩٨٨/٧/٢٢ هەر لەسەر گردی ڕەمکان زامدار بوو و دوای کەمێك لەهەمان ڕۆژدا گیانی لەدەستدا و شەهید بوو، لای بارەگای هێز لە نێو قەڵاتووکان بە خاك سپێردراوە.

بەدەماریی و خۆڕاگریی بوو، هەروەها سیفەتی شەرم و شکۆ، سیفەتی ڕێز و ویقار، شتێکی زۆر زەق و بەرچاو بوون لەوی دا، ئینسانێك بوو کە بە پێوە هەڵیدەکردە[1] سەر دوژمن، ئەوەندە شانازییە بۆوی بەسە، کە یەکێك بوو لەو حەوت (٧) کەسە فیداکارانەی کە هێرشیان کردە سەر دوژمن و تێکیان شکاند و لە ئەنجامی هێرشەکەیدا شەهید بوو، وەك لە خاڵی چوارەمدا باسی دەکەین.

**شەهیدی دووەممان: کاك ئەحمەد سکتانیی:**

کە وردبینیی و لێزانیی و خۆڕاگریی و صەبر و حەوسەڵە و سینگفراوانیی، چەند سیفەتێکی زەق بوون لەوی دا، کاك ئەحمەد سکتانییش یەکێکە لە برا هەرە لە پێشووەکان و یەکێکە لەوانەی کە لەیەکەمین ڕۆژی جیهادەوە وەدەرکەوت و پەیمانگای بەجێهێشت لە پێناوی خوا دا.

**شەهیدی سێیەممان: کاك عومەر بۆسکێنی:**

کە یەکێك بوو لەوانەی پێشتر ڕێیەکی خوار و خێچی گرتبوو، بەڵام وەك برایان لێ دەگێڕنەوە گوتبووی: ئەوە لێرە خۆم ساغ و یەکلاکردەوە بۆ خوا، ئیدی ئەوجار دێم لە پێناوی ئیسلامدا خەبات دەکەم، لەپێناوی خوا دا خەبات دەکەم، هات و دیارە نیازەکەی پاك بوو، بۆیە بەکەڵکی ئەوە هات کە خوا هەڵیبژێرێ و بیبات بۆ خزمەت خۆی.

**شەهیدی چوارەمیشیان: کاك طاهر مەمەنداوەیی:**

من بۆخۆم لەسەر گردی گوێم لێ بوو، دەیگوت: (بەخوا زۆر خۆشە ئینسان لە پێناوی خوا دا شەهید بێت، دەمگوت: کاك تاهیر جار جار سەری خۆت

(١) هەڵیدەکردە سەردوژمن: پەلاماری دوژمنی دەدا. ع.ب.

نزم بکە، شەڕ دەبێ بە حیکمەتەوە بکرێت، دەیگوت: مامۆستا! ئەوپەڕی ئیحتیمال هەر ئەوەیە کە شەهید بین، شەهیدییش لەلای ئێمە گەورەترین ئاواتە).

## خاڵی چوارەم:

چۆنێتی شەهیدبوونی ئەو برا عەزیز و خۆشەویستانە:

بە نیسبەت کاك (تاهیر)ەوە، کە لەپێش هەمواندا شەهید بوو، لەسەنگەرێدا وێی کەوت و دوایی بە برینداریی بەڕێمان کردەوە، بەڵام لە ڕێیە شەهید بوو و وەفاتی کرد.

کاك عبدالرحمان و کاك ئەحمەد و کاك عومەر- یش، ئێمە دوای ئەوەی ئێمە سێ شەو و سێ ڕۆژ... سێ شەو و سێ ڕۆژ پێشمەرگە قارەمانەکانی هێزی حەمزە، لێزمەبارانی تۆپ و خومپارە و بیکەیسی و ئارپیچییان بەسەردا دەباری، سێ شەو و سێ ڕۆژ، دەتوانم بڵێم: مەگەر چۆن دەنا - بەتایبەتی برایانی سەر گردی ڕەمکان- خەویان نەچۆتە چاوان، هەروەها برایانی دیکەش لەولاولایان، چونکە ئێمە قوەتێکی ئیحتیاتمان نەبوو، لەبەرئەوە کە مەیدانی کار و چالاکییمان زۆر فراوان بوو، لە پێنج شەش نوختەدا ئێمە بەرگرییمان دەکرد، ئەوەی کە هەمان بوو و نەمانبوو، هەمووی لە سەنگەرێدا بوو، دوای ئەوەی کە برایانمان تینوو و برسی دەبوون و ناڕەحەت دەبوون، خەواڵوو دەبوون، کەسێك نەبوو بێتە جێیان و جێگایان بگرێتەوە و ئەوان ئیسڕاحەتێك بکەن، بەڵێ دوای هێرشێکی درێژخایەن و بەردەوام و بێ پسانەوەی سێ شەو و سێ ڕۆژە، کە من بۆخۆم لەسەر

گردی ڕەمکان بووم، لە ڕۆژی سێیەمدا کە هێرشەکە لەهەمووی خەستتر بوو، دوای نوێژی عەصر، بڕیاردرا کە ئێمە هێرشێك بکەینەوە سەر دوژمن، لەبەرئەوەی کە برادەرانی پارتی و ئەوانی دیکە لەلای ڕەزگەوە بەتەمای وان لێیگەڕابووین، بەڵام وادیار بوو ئەوان قوەتیان پێ نەشکابوو، کشابوونەوە، قوەت خاصەیەکی زۆر لەلای ڕەزگەوە خەریکی پاشەوبڕمان بوون[1]، لای کانییەکەشمان لێ گیرابوو، ماوەیەکی زۆر بوو ئاومان نەمابوو، یانی: ئاو نەمابوو بیخۆینەوە، نانیشمان لێ بڕابوو، زۆربەمان برسیی بووین و بێ خەوییش و قەسپی تۆپی بەردەوامیش لەوێ ڕابوەستێ، کە ئینسان کاس دەبوو، ئارپێچی و ڕیزەی بیکەی سی لێکدا لێکداش سەرباری هەموو شتێك، بەڵێ بڕیارمان دا بۆ ئەوەی یەکجاریی دەورە نەدرێین، دژەهێرش بکەینەوە سەر دوژمن، بابزانن کە نەفەسێکمان لەبەردا ماوە، گوتم: کاکە گیان کێ ئامادەیە؟ سوپاس بۆ خوا هەمووی لە هەموو ئامادەتر بوو، بەڵام من بۆخۆم حەوت (٧) کەسم لێ هەڵبژاردن.

یەکەمیان بۆخۆم، هەرچەندە برایان زۆر سوور بوون لەسەر ئەوەی کە نابێ بچم، گوتم: نەخێر! حەتمەن دەبێ لەگەڵدا بم.

دووەمیان: مامۆستا حەسەن بابەکر.

سێیەمیان: مامۆستا مەلا عەلی مەمك.

چوارەمیان: مامۆستا عبدالرحمن.

پێنجەمیان: کاك ئەحمەد سکتانیی.

شەشەمیان: کاك ئومێد بۆسکێنی.

(١) پاشەوبڕ: پشت لێبڕینەوە، لای پشت لێگرتن. ع.ب.

حەوتەمیان،: کاك ڕەسوڵ بەستەستێنی.
بەڵێ ئەو حەوتە بڕیارماندا کە هێرش بکەین و نەگەڕێینەوە هەتا دوژمن لە جێی خۆی هەڵدەکەنین، بەهەر نرخێك تەواو بێ، دەبێ ئەولای کە لێیان بڕیوینەوە، لەوێی هەڵقەنین، ئیدی لێمان لە (ألله أکبر) داو، دوای ئەوەی شوێنی دوژمنمان تەشخیص کرد، کاك ئەحمەد (بەڕەحمەت بێ) ئارپیچیی پێ بوو، ئێمەش هەموو بە کلاشینکۆفەوە، لێماندان و هەڵمانقەندن، بەڵام چ هەڵقەندنێك و چ ڕاونانێك! ژمارەیەك کەلاکمان لێخستن، هەم لە قوەت خاصەکان و هەم لە جاشەکان، بەڵام بیستم گوتیان: کاك ئەحمەد شەهید بوو، کاك ئەحمەد بانگی کرد گوتی: مامۆستا! ئەمن ئەنگوام[١]، لەولای ئێمەشەوە مامۆستا حەسەن بانگی کرد گوتی: مامۆستا عبدالرحمن شەهید بوو، ئەوانە زۆر وەجێی هەتەرێیان کەوتبوو[٢] تەقریبەن بە ڕووح گەیشتینە سەریان، بەڵام نوتقیان نەبوو، کاك عومەر بۆسکێنییش کە لەگەڵ هێرشەکەدا نەبوو، لەگەڵ حەوت کەسەکاندا نەبوو، بەڵام لەسەنگەرەکەیدا هەرچەندە ئەمیرەکەی پێی گوتبوو مەڕۆ، خۆی ڕانەگرتبوو، بە (ألله أکبر) هاتە خوارێ، ئەویش هەر بەڕێوە، پێموابێ وێڕانەگەیشتبوو دەست بوەشێنێ، ڕیزە فیشەکێك لە سینگی درابوو، ڕیزێکی تەویان لێدابوو، ئەویش شەهید بوو، مامۆستا مەلا علی مەمك لە تەنیشت من بوو، بە دوو جێ بریندار بوو، ئێمە ماینەوە سێ کەس، زیاتر هێرشمان کردەوە سەر دوژمن، تەماشامان کرد یەکێك لەبن بەردێکدا خۆی مەڵاس دابوو، من یەك ڕیزم لێدا، لەوێدا تەواو

(١) - ئەنگوام: پێکرام. ع.ب.

(٢) وەجێی هەتەرێیان کەوتبوو: شوێنی پێکوژرانیان پێکرابوو. ع.ب.

بوو، دوایی ئەوانە ڕایان کرد و هەڵاتن، بە کورتیی چۆنیەتی شەهیدبوونی ئەو برایانە بەو شێوەیە بوو.

سوپاس بۆ خوا، لە کاتێکدا کە خەڵك لەکاتی هەڵاتنێدا دەکوژرێ و لە پشتەوەی دەدرێ! زۆربەی ئەوجاشانەی کە ئێمە لێمان داون، هەڕۆن[1] لە جاشەکان بپرسن، زۆربەی هەرەزۆریان لەپاشەوە لێیان دراوە، بەڵام برایانی ئێمە، کاك عبدالرحمن لە نێوچاوانی دراوە، کاك ئەحمەد لە سینگی دراوە، کاك تاهیر لە سینگی دراوە، کاك عومەر بۆسکێنی هەر لە زگ و لە سینگی دراوە، برایەکمان نیە کە لەپاشەوەڕا گوللەی وێکەوتبێ، هەمووی لەکاتی هێرش بردندا بووە، منیش شەڕواڵەکەم دووسێ گوللەی پێوەن[2]، بەڵام خوای بەرز و مەزن پاراستوومی و بە جەستەم نەکەوتوون.

## خاڵی پێنجەم:

بێینە سەر مەسەلەیەکی دیکە، هەندێك کەس دەڵێ: باشە ئێوە بۆچی کشانەوە، بۆچی سەر گردتان[3] بەجێ هێشت؟! ئێمە دەڵێین: هەرکەسێك ویژدانێکی هەبێت و بە ئینصافەوە تێبفکرێت! زۆرچاك دەزانێ کە ئێمە پێویست بوو بکشێینەوە، ئەگەر نەکشابایینەوە یەك کەسیشمان لێ قوتار نەدەبوو، ئێمە هەمووومان دەوری سی (٣٠) کەس بووین لەسەر گرد، برایانیشمان لەسەر (ڕۆژتەرازووان) نیمچە موحاسەرە بوون، برایانی دیکە

(١) هەڕۆن: بچن. ع.ب.

(٢) ئەوکاتە نەمزانیبوو، بەڵام دوایی دەرکەوت، کە پشتێنەکەشم فیشەکی پێوەبوون، بەڵام گۆشتیان نەگرتبوو! ع.ب.

(٣) واتە: گردی ڕەمکان. ع.ب.

لەسەر (شاخی جیقنە) دەورەدرابوون و مەجالی فەعالیەتێکی وایان نەبوو، ئەوانی دیکە، هەندێکیان مەشغووڵی نان هێنان و نانکردن و ئەوانەبوون، ئەوەی هەبوو هەمووی شەل و شکست و ماندوو بوو، دوژمنیش: شەش حەوت فەوجە خەفیفە هاتبوو، قوەت خاصەیەکی زۆر کە ژمارەیان لە هەزار بەرەو ژوور بوو، ئنجا ئێمە ئەگەر دووسەدی دیکەشمان لێیان کوشتبان، بەڵام دوایی هەرچۆنێکی بێ، هەر هێزی ئەوان زیاتر بوو، نەمان دەتوانی گردەکە بپارێزین، کە تەماشامان کرد شەڕەکەمان بێ ئەنجامە، وامان بەچاك زانی بەجێی بهێڵین، بۆئەوەی بۆ جارێکی دی، خۆمان کۆبکەینەوە و زەبرێکی چاکتر لە دوژمن بدەین، خوا پشتیوان بێ .[1]

ئنجا ئێمە یەکەمین کەسیش نین کە کشاوینەوە، لە پێش ئێمەدا (خالیدی کوڕی وەلید) لە جەنگی (مؤتة)دا لەگەڵ هاوەڵان، کە سێ هەزار (٣٠٠٠) کەس بوون، بەڵام دووسەد هەزار (٢٠٠٠٠٠) نەفەر لە ڕۆمەکان و لە عەڕەبە خۆفرۆشەکانی ئەوکاتە، ڕووبەڕوویان بوون، کە زانی شەڕێکی بێ ئەنجامە، زانی سەرەنجامیان تێداچوونە، بۆیە پاشەکشەی کرد و گەڕایەوە، کاتێك چوونەوە مەدینە، منداڵ خۆڵیان پێدادەدان و پێیان دەگوتن: (یا فُرّار)! ئەی ڕاکردوان، بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: (ليسوا بالفُرَّارِ، ولكنَّهم الكُرَّارُ إنْ شاء اللهُ تعالى) واتە: ڕاکردوو نین، بەڵکو ئەگەر

(١) سەرەتای کشانەوەکەمان بۆ کانی ساوێن و بەستەمەلە بوو، کە بنکەیەکمانی لێ بوو، لەوێ هێزەکانمان زیاتر ڕێکخستنەوە، ڕژێم ئەو سنوورەشی تۆپباران دەکرد و هێرشی بۆ دێنا، بەو هۆیەوە لە ١٩٨٨/٧/٢٨ پێشمەرگەیەکمان بەناوی عوسمان عەلی وەتمان بە تۆپ برینداربوو، پاشان لەو قۆناغەدا چووینە چۆمان و کەڵەکین و خڕندۆڵ و مالەخ و سنووری چیای کونەکۆتر، کەوتینە بەرگریی و لەهەندێك شوێن ڕووبەڕووی ڕژێم بووینەوە

خوا بیەوێ هێرشبەرەوانن .[١]

ئنجا ئێمە بۆ جیهاد ئەو شوێنانەمان گرتبوون، جیهادیش شەهیدبوون و بریندابوون و سەركەوتن و تێشكان و ئەوانەی هەموو تێدان، ئێمە ئەگەر شەهید نەدەین لەپێناوی خوادا، جیهادكردن یانی چی؟! جیهاد یانی سەرفكردنی ئەوپەڕی توانا، ئەوپەڕی تواناش ئەوەیە: بەخوێن و بە ڕووح بەخشین لە پێناوی خوادا خەبات بكەی، ئەوانەش كەچاوەڕوانیی ئەوە لە ئینسانی موجاهید دەكەن و چاوەڕوانیی ئەوە لە پێشمەرگەی ئیسلام دەكەن، كە هەر لە دووڕرا چاوی بە دوژمن كەوت، ڕابكا! بابای ئاوا لە ڕاستییدا پیاوی مەیدانێ نیە و مەردی جیهاد نیە و جیهاد بەوانە ناكرێت، ئێمە ئەگەر زانیبامان قوەتمان بە دوژمن دەشكێ و دەتوانین گرد بپارێزین، ئەگەر نەك چوار شەهید، توانامان هەبوایە چوار هەزار شەهیدیشمان دابایە، گردمان بەجێ نەدەهێشت، چونكە ئێمە بۆ شەهیدی هاتووینە مەیدانێ و، دوو ئاواتمان هەن، یەك لە یەكی شیرنتر، سەركەوتن، یان شەهیدیی.

## خاڵی شەشەم:

مەسەلەیەكی دیكە، ئەوەیە كە ئێمە لەو جەنگەدا، زۆر چاك ماهیەتی جاشانمان بۆ وەدەركەوت، هەرچی جاشی لە بیتوێن و پشدەر و ئاكۆیەتیی هەیە، لەوشەڕەی قەڵاتووكاندا بەشداربوون، هەر هەموویان ناوەكانیان تۆماركراون لە مێژوودا، ناوی ئەو موستەشار و سەرۆك جاش و خۆفرۆش و خائینانە، كە دیفاع لە ڕژێمێكی بۆگەنی زاڵم دەكەن و شەڕ لەگەڵ برای

(١) السیرة النبویة لابن هشام، ج٤ ص ٢١٥ دار ابن الهیثم/ ٢٠٠٢

هاودینی خۆیاندا دەكەن، ناویان لە لاپەڕەی ڕەشی تەئریخدا تۆماركراوە و ناویان لەسەر پەڕەی دڵ و مێشكی هەموو پێشمەرگەیەكی بەجەرگ و بە ئیمانی مسوڵمان تۆماركراوە و دەڵێین: با بۆیان لەنێو دوو نانی گەرمدا بێ، خوا یاربێ، دەبێ زەبری ئیسلامیان پێ بكەوێ، دەبێ كارێكیان پێ بكرێت، ئەوەی كە خواردوویانە بیهێننەوە!

ئێمە ماوەیەك لەمەوبەر لەژێر ناوونیشانی (دیاردەی جاشەتیی دا) سێ وتارمان لەسەر بڵاوكردنەوە، هێندێك ئینسانی نەفام و خۆبەدین هەڵاوەسی بیر كورت و دنیا پەرست، ناڕەزاییان هەبوو، گوتبوویان: فڵانكەس بە توندیی هێرشی كردۆتە سەر جاشان و دەڵێ: هێندێكیان كافرن، زاڵم پەرستن، دنیا پەرستن، ئەوە وانیە! بەڵام دەركەوت كە وتارەكانی ئێمە لەجێی خۆیاندا بوون و قسەكانمان ڕاست بوون، ئاخر لەوە زیاتر كە بابای جاش، بتوانێت بێت ئینسانێك شەهید بكات كە قوڕئانی لەسینگ دایە، دەستی بڕواتە ئینسانێك و بە ئاڕپێچیی لێیبدا و لە سەنگەرێدا تەختی بكات، كە دیفاع لە ئیسلام دەكات! بێن قوڕئانەكانی نێو مقەڕەكانی قەڵاتووكان بسووتێنن! ئەو مقەڕانەی كە شەونوێژیان تێداكراوە، ڕۆژووی سوونەتیان تێداگیراوە، زیكر و تەسبیحاتیان تێداكراوە، بیانسووتێنن! كەسانێك ئەوە پەرێز و شوێنەواریان بێت، بابایەكی جاش كە ئەوە بەرهەمی بێت و، ئەوە كردەی دەستی بێت! چۆن دەتوانی بە مسوڵمانی لەقەڵەم بدەی؟! چۆن دەتوانی بڵێی: زەڕڕەییەك ئیمانی لە دڵ دایە[1]؟! كەسی وا بۆ دنیاپەرستیی و بۆ

(١) ئەم قسانەم زێدەڕۆیی (مبالغة)یان تێدایە و، چەكدارەكانی ئەوسای ڕژێمیش جۆراوجۆر بوون و، حوكمی جیاجیاشیان هەبوون. ع.ب.

صەدام پەرستیی یەكلابۆتەوە و ئەصڵەن زەڕڕەی ئیمانی بە دڵیەوە نەماوە، دەنا دەستی ناڕواتە پێشمەرگەی ئیسلام شەهیدی بكات، دەستی ناڕواتە قورئانێ بیسووتێنێت، دەستی ناڕواتە بنكەی ئیسلام كە عیززەتی (ئیسلام)ی پێوەیە، بیڕوخێنێ! ئنجا ئەوانەی كە تاكو ئێستا سادە و نەزان بوو ون، ئەوانەی كە تاكو ئێستا جاشیان نەناسیون، با زۆر چاك بیانناسن، ئەوەیە پەرێز و بەرهەمیان، ئەوەیە خۆ بەمسوڵمان لەقەڵەمدانیان ![1]

سوپاسی ئەو كۆمەڵە برایەش دەكەین كە لە ناوچەی سەردەشت و ئاڵوەتانەوە، بە ئیمدادی ئێمەوە هاتوون[2]، هەرچەندە دەفریا نەكەوتن، لەبەرئەوەی درەنگ هەواڵەكەیان بیستبوو، لەبەرئەوەش كە ڕێیەكە زۆر دوورە، دەفریانەكەوتن بگەنە گەرمەی جەنگەكە، بەڵام خوا پاداشتیان

(١) دیارە لەو چەكدارانەی سەربەڕژێم كە بە (جاش) ناسرابوون، لە هەموو ئاستەكاندا كەسانی واشیان تێدابوو، كە لەناوخۆدا هاوكاریی شۆڕش و پێشمەرگە و لایەنەكانیان دەكرد و پەیوەندییان پێوە هەبوون، هەروەك چۆن لە ڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١ یشدا بەشێكیان بەشداربوون و ڕۆڵیان بینی. ع.ب.

(٢) ئەو برایانە پێشمەرگەی هێزی (حسن البنا) بوون، دیارە دواتریش لە قەندیل، چەند مەفرەزەیەكی دیكەی هێزەكانی (فاروق و خالید و نەصر) بەمەبەستی بەهاناوەهاتن و هاوكاری هاتن، بەڵام سەرەڕای ئەوەی، بەهۆی دوورە دەستییەوە هیچیان فریای شەڕەكەی گردی ڕەمكان و قەڵاتووكان نەكەوتن، بە هەنگاوەكەیان گەلێك دڵخۆش بووین و زۆر سوپاسمان كردن، خوای میهرەبان بە باشترین شێوە پاداشتیان بداتەوە.

هەروەها هەر دوای داستانەكە و كشانەوەمان لە قەڵاتووكان، بەشێكی هێزی (شافیعی) كە ژمارەیەكیان لە ناوچەی مەلەكانەوە دوای هێرشەكانی ڕژێم بۆ سەر سنوورەكەیان بەرە و قەندیل هاتبوون و، بەشێكی هێزی (ئازادی) كە لەكاتی شەڕی قەڵاتووكان بە فەرماندەیی شەهید مامۆستا مەغدید حسێن دامەزرابوو، گەیشتنە قەندیل، دیارە ئەوانیش بەهەمان شێوە فریای شەڕەكەی گردی ڕەمكان و قەڵاتووكان نەكەوتن.

بداتەوە و بەپێی نیەت و نیاز و مەبەستی خۆیان، کە شەهیدیی و جەنگ کردن بووە، پاداشتیان لەسەر خوایە و ئێمە زۆر سوپاسی ئەو هەست و نەستەیان دەکەین و دەڵێین: خۆزگە هەموو ئەوانەی کە خۆیان بە مسوڵمان دەزانن، هەموو ئەوانەی کە خۆیان بە پێشمەرگەی ئیسلام لەقەڵەم دەدەن، ئەو ئامادەییەیان تێدا هەبایە لە کاتێکدا کە دەبیستن، برایەکی مسوڵمانیان لەولا تووشی شکستییەك بووە، کۆمەڵە برایەکی مسوڵمانیان، هێزی کوفر دەورەی داون، ئابڵووقەی داوە، ئەوەندە ئیمان و جورئەتەی هەبێت، لەخۆی ڕاببینێت بێ بەرگرییان لێبکات و لەسەرتان بکاتەوە.

تەماشا دەکەین ، دوای ئەوەی هێندێك لەو فەوجە خەفیفانەمان لەزەلزەلە نابوون، کوشتەمان زۆر لێدان، هەموو جاشی ئەولاولا هاتن بۆ دیفاع لێکردن و لەسەرکردنەوەیان، بەڵام کەسانێك هەن خۆیان بە پێشمەرگەش دەزانن و، دەیانزانی کە ئەگەر گردی ڕەمکان لەقیس بچێت، هەموولا زەرەرێ دەکەین، بەڵام دەیانبینی: ئێمە سێ شەو و سێ ڕۆژان تۆپ و خومپارەمان بەسەردا باری، ئەوجار دوای ئەوەی کە ئێمە کشاینەوە، ئەوجا بە دێروژوانەوە دەڵێن: ئەوە گردتان لە دەست دا؟!

هەروەها زۆربەداخەوە کەسانێك هەن خۆیان بە پێشمەرگەی ئیسلام لەقەڵەم دەدەن، بەڵام لە هێندێك جێیان لێی دانیشتوون و، چاوەڕێی قەزا و بەڵای خوای دەکەن، داخۆ کەنگێ دەمرن!

بەهەر حاڵ، مەردی مەیدانێ و ئینسانی خواناس و ئیماندار، لەکاتی ناسك و دژواردا، لە کاتی بەزەحمەتدا، لەکاتی ترسێ دا، ماهیەتی خۆی وەدەردەخات.

## خاڵی حەوتەم:

ئێمە چەند ڕۆژێك لەمەوبەر هێندێك هەواڵمان پێگەیشتنەوە، کە هێندێك کەس لە بەعزە هەڵوێستێکی ئێمە ڕەخنەی هەبووە، بۆ نموونە: موچە و معاش نەدان بە پێشمەرگە! بەڵێ ئێمە یارمەتییمان لە داخیلەوە بۆ هاتووە و سوپاس بۆ خوا دەشهێت و، لەولاشەوە یارمەتییمان وەرگرتووە، بەڵام نەمانکردوە بەعادەت کە سەری مانگان بڵێین: وەرە برای پێشمەرگە! ئەوەندە یارمەتی خۆت، ئنجا بەعزە کەسێکی سادە و نـەزان، بەعزە کەسێك کە هەر بەرپێی خۆی دەبینێت و ئەولای نابینێت، گوتوویانە: فلانکەس شتێکی غەڵەت دەکا، بێنە هەرچی پارە هەیە لە (بیت المال)دا بیدە بە پێشمەرگەکان، ئەدی ئەگەر دوایی پەکمان کەوت؟! دوایی بڵێ: پێشمەرگەکان! بێنن یەکی پێنج دینار، دە دیناران!

ئنجا دیقەت بگرن ئەمڕۆ ڕاستیی هەڵوێستی ئێمە و خوار و خێچی بیرکردنەوەی ئەو جۆرە کەسانە وەدەردەکـەوێـت، ئایا ئەمڕۆ ئەگەر پارەیەکمان نەبێ لە (بیت المال)دا، بەچی مقەڕ دادەنێینەوە؟! ئەوە کەل و پەلەکەمان لەوێ بەجێما، زەخیرەکەمان لەوێ بەجێما[1]، ئەگەر پارەمان لە

---

(١) سوپاس بۆخوا، دوای ئەوە دوو شەوی لەسەریەك، بە هیممەتی براکاروانچییەکانمان، کە وەك هەمیشە مەردانە بەهانامانەوە دەهاتن، لەگەڵ هەندێك لە براپێشمەرگەکاندا چوونەوە نێو قەلاتووکان، کە جارێ دیابوو دوژمن نەیوێرابوو بێتە نێو بارەگاکان، بۆیە زۆربەی کەل و پەلی سووك و بەردەستمان هێنایەوە بۆ بنکە و بارەگا نوێکانمان لە قەندیل، بێگومان ئەمە زۆریش پڕ مەترسیی بوو، بەڵام سوپاس بۆ خوا سەری گرت و سەلامەت بووین.

(بيت المال)دا نەبووایە، بە سواڵ و صەدەقەی پێشمەرگەی ڕووت و برسی، زاد و زەخیرە کۆدەکرێتەوە؟! چەك دەكڕدرێ؟! تەقەمەنی دەكڕدرێ؟! کەواتە: ئیسنان دەبێ بە ویژدان بێت، ئینسان دەبێ گومانی چاکی هەبێت بەرامبەر بە سەرکردەی خۆی، نابێ هەرلەبەهانە بگەڕێ، دەبێ متمانە و باوەڕی بە بەرپرسانی خۆی هەبێ، بەڵێ ئێمە سوپاس بۆ خوا پارەمان لە (بيت المـال)دا ماوە، هەموو مانگان نەمانداوە بە پێشمەرگە، بەڵام ئایا زەرەرمان کردوە، یا قازانج؟ پێشمەرگە (ألحمد لله) تێر و پڕ بووە، بۆمان بە زاد و زەخیرە، بۆمان بە چەك و تەقەمەنی وکەل و پەل داون و میقدارێکیشمان پاشەکەوت کردوە و ماڵی سپی بۆ ڕۆژی ڕەش! ئایا ئەو هەڵوێستەی ئێمە ڕاستە، یان ئەوە هەرچی دەهات تەوزیعمان کردبایە و ئێستا لەسەر ساجی عەلی دانیشتباین! ئاوا چاك بوو؟! هەروەها زۆر جۆرە گومانی دیکە و زۆر جۆرە قسەی دیکەی بێ سەروپێ، کەمەجالی ڕەددانەوەیان نیە، بەڵام ئەو کەسانە لە مەیدانی عەمەل و واقیعدا، دوایی بۆیان دەردەکەوێ کە سەرەوبن حاڵی بووبوون.

لە کۆتاییدا دەڵێم: جیهاد شەو و ڕۆژێك نیە و مەیدانی جیهادیش بستە عەرزێك نیە، وەك لە ئەوەڵەوە گوتم، جیهاد هەر لەوکاتەیەوە کە تۆ دەستت چەك دەگرێت، بەردەوامە هەتا دەچیە بن گڵ، بەردەوامە هەتا بە کۆچان دەڕۆی، جیهاد لە ژیانی ئۆممەتی ئیسلامییدا هەر لەوکاتەوەی کە پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) هاتوە هەتاکو دانەیەك لە ئۆممەتی (محمد) دەمێنێتەوە، جیهاد دەمێنێت، مەیدانی جیهادیش نەتەنیا سەر (گردی ڕەمکان)ەو نەتەنیا سەر

(ڕۆژتەرازووان)ەو نە تەنیا سەر (بێ دێو)[١]ەو نە بەس دیوی (ڕەزگە)[٢]یەو نە (قەڵاتووکان)ەو نە (بەری ئەبووبەکرە)[٣]یە، نەتەنیا کوردستانیشە، مەیدانی جیهاد هەموو دنیایە، لە هەر جێ یەکی زاڵم و کافرێکی لێ بێت، لەسەر ئەو ئیماندارانەی کە لەوێن، فەڕزە کە جیهادیان لەگەڵدا بکەن، بەڵێ لە هەرشوێنێك ئیماندارێك هەبێت، دەبێ لەگەڵ ئەو زوڵم و ستەم و چەوساندنەوەیەی کە هەیە، لەگەڵ ئەو فەساد و کوفرەی کەهەیە، لەگەڵیدا دەستەویەخە بێت، ئیماندار ناتوانێ بە زەلیلیی و بە زەبوونیی بژی، ئیماندار قەت ژێردەستەیی پێ قبووڵ ناکرێت، بۆیە هەتا ئیماندار بمێنێت و، هەتا زوڵم و ستەم بمێنێت، جیهاد بەردەوامە.

ئێمە ئەمڕۆ گردی ڕەمکانمان بەردا، لەبەرئەوەی بەرژەوەندیی ئیسلام وای داخوازدەکردو مانەوەمان وەك چقڵی چاوی دوژمن، وای پێویست دەکرد، بەڵام لە شوێنێکی دیکە تێهەڵدەچینەوە، لەولای تێهەڵدەچینەوە، قەسەم بەخوا! ئەگەر بستە عەرزێکمان بەدەستەوە نەمێنێ لە ناوچەی ئازادکراوی کوردستان، ئێمە ئەوەی کە شەهامەت و غیرەتی هەبێت، پەیمان لەگەڵ خوادا دەبەستین، هەر هەمووومان دەچینەوە نێو شارەکان، وەك خوا دەفەرموێ: (...فَقَاتِلُوا أَئِمَّةَ الْكُفْرِ...)[٤]، دەستدەکەین بە لێدانی ئەو زلەزلانەی کە میللەتی ڕەش و ڕووت هەڵدەخەڵەتێنن، هەرنەبێ شارەکان بەدەستەوە دەمێنن، شەڕی کۆڵانە و کۆڵان دەمێنێت! بەڵێ جیهادی ئێمە بەردەوامە، جیهادی ئێمە کەمترین ئەندازەی لێ

(١) ئەو شاخ و گردانەن کە کەوتوونە دەوری گوندی قەڵاتووکان.

(٢) گوندێکە لە نزیك قەڵاتووکان و سەر بە ناحیەی ژاراوەیە.

(٣) ئەبووبەکرە: گوندێکە بەرامبەر قەڵاتووکان و هەردووکیان سەر بە ناحیەی سەنگەسەرن.

(٤) التوبة - ١٢ .

کەم نەبۆتەوە، تۆزقاڵێکی لێ دانەشکاوە، عەزم و ئیرادەمان هەر لەجێی خۆیەتی، ئەگەر تۆزێك ماتەمینییەکمان پێوەدیارە، لەبەرئەوەیە کە چەند عەزیزێکمان لە دەستداون، هەڵبەتە ئەوانە بەشوێنی خۆیان گەیشتوو ون، ئەوانە ئینشائەڵڵا جێگایان (فردوس ألأعلى)یە، هەروەها لەبەرئەوەیە کە پێمان ناخۆش بوو، کەسانێکی خۆفرۆش، کەسانێکی ترسنۆك، بەزیوو، هیچ و پووچ، بتوانن جێی کەڵەپیاوان بگرنەوە، ئنجا بیستوومانە کە ئەو جاش و جووشە هاتوون بۆ وێ، کەیف و خۆشییان دەربڕیوە، زلەزلەکانیان قسەیان کردوون، هەندێك برا بەجیهاز قسەکانیان وەرگرتوون، ئەو قسانە هەموو هەڵدەگیرێن، ئەو هەڵوێستانە هەموو دەپارێزرێن با زۆر چاك بزانن! هەتا کاتی خۆی.

بەڵام ئەوەش با هەموو کەس بیزانێ، کە ئەو جاشانە کاتێك توانیان بێنە سەر گردی ڕەمکان، کە ئێمە دەوری دوازدە سەعات بوو لەوێ نەمابووین! ئێمە بە شەوێ کشاینەوە و ئینسیحابمان کرد، بەڵام ئەوان تاکو سەعات دوازدەی نیوەڕۆش - لەگەڵ ئەوەی کە تاقە پێشمەرگەیەکمان نەبوو لەسەر گردی ڕەمکان- بە هەموو چەکێك لە گردیان داوە، ئنجا دەوری سەعات دوازدە توانیان بچنە سەرگردی! بە مردووییش ئەوانە ناتوانن بەسەر قەبری ئێمەدا هەنگاوبنێن! دوازدە سەعات بوو ئێمە لەسەر گردی ڕەمکان نەماوین، ئەوجار ئەوانە بە ترس و لەرزەوە توانیویانە بچن! ئەوانە کاتێك توانیان جێی ئێمە بگرنەوە، کە ئێمە دە دوازدە سەعات بوو لەوێ نەمابووین، کاتێك توانیان بێن قەڵاتووکان بسووتێنن، کە کەڵەمەرد و شێرەپیاوانی پێشمەرگەی ئیسلام لەوێدا نەمابوون!

لە كۆتاییشدا: بەوپەڕی عەزم و تەصمیمەوە، بەوپەڕی ئیرادەی پۆڵایین و بەهێزەوە، پەیمان لەگەڵ خوادا نوێ دەكەینەوە و دەڵێین: ئەی پەروەردگارمان! ئێمە ئەوانەی كە پەیمانمان لەگەڵ تۆدا بەست لەبن داربەڕووەكانی قەڵاتووكان و، لەبن چیای سەركەشی گەلاڵە و لە بن گردی ڕەمكی وكوێ و كوێ، ئێمە هەر هەمان پێشمەرگەین، ئێمە هەر هەمان شۆڕشگێڕ و موجاهیدین.

ئەی خوایە! ئەوەی كە تۆش بەسەرمان دێنی، دەزانین بێ حیكمەت نیە، دەزانین كە پەند و ئامۆژگاریی و مەصڵەحەتی تێدایە، ئێمە هەر بەردەوامین و بەوەش كە خوا بەسەری هێناوین، زۆر شوكرین، ناڕەزایی دەرنابڕین بەرامبەر بە خوای كارزان، خوا دەفەرموێ: (...وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ ...)[١] ، زۆر جار شتێكتان پێ ناخۆشە، بەڵام عەینی مەصڵەحەت و چاكە و قازانجی تێدایە، بە چ مەعلوومە خوای باڵادەست بۆیە ئێمەی لەوێ لانەبردوە، كە جێیەكی باشتر بگرین، مەیدانێكی فراوانتر بگرین و زەبرێكی چاكتر لە دوژمن بدەین، ئنیشائەڵڵا هەر وایە! پەیمان لەگەڵ خوای بەرز و مەزن دا نوێ دەكەینەوە كە: ئێمە هەر لەسەر بەڵێنی خۆمانین، هەر لەسەر وەعدی خۆمانین و هەر خاوەنی ئیرادەی پۆڵایینی جارانمانین.

سەرەخۆشییش لە كەس و كاری هەرچوار شەهیدەكان دەكەین: سەرەخۆشی لە بابی مامۆستا عبدالرحمن و لە ماڵ و خێزانی و لە منداڵەكانی و دایكی و لە خزمانی دەكەین، لە خوای میهرەبان دەپاڕێینەوە: سێبوورییان بخاتە نێو دڵی و لێی دەپاڕێینەوە كە ئەو قوربانییەیان لێ قبووڵ بكات، بەڕاستی قوربانییەكی زۆر

(١) البقرة - ٢١٦ .

بە قیمەتیان لە پێناوی ئیسلامدا بەخت کرد، (حاجی شێخ مەحمود)[1] کاغەزێکی ناردبوو بە تۆمارکراویی، گوتبووی: من کاتی خۆی بە (عبدالرحمن)ی کوڕم گوتوە، (عبدالرحمن)! نەچی لەدوای فلانکەسی وەبی[2]! نەچی وازی لێ بێنی ها! هەتا دوا تنۆکی خوێن، دەنا بە کوڕی خۆمت لەقەڵەم نادەم! ئێمە باوکی ئاوامان دەوێت، نەك ئەو جۆرە کەسانەی کە هەزار درۆ و دەلەسە لەگەڵ کوڕەکانیاندا دەکەن و، فریویان دەدەن دەیانبەنەوە خوارێ: وەرە ژنێت بۆ دێنم و، وەرە سەیارەت بۆ دەکڕم و، وەرە چی و چیت بۆ دەکەم! دوایی دەچێتەوە لەوێ دەبێتە جاش، یان دەبێتە سەرباز و لە پێناوی شەیتاندا دەڕوات و دەبێتە مایەی سەرشۆڕیی و شەرمەزاریی بۆ خۆی و بۆ کوڕەکەی بۆ دنیا و قیامەتان.

هەروەها سەرەخۆشیی لە بابی کاك ئەحمەد سکتانیی و لە کەس و کاری و لە برایەکانی دەکەین، لەخوای بەبەزەیی دەپاڕێینەوە کە سێبووریان بخاتە نێو دڵ و پاداشتی هەرەبەرزیان بۆ بنووسێت.

هەروەها سەرەخۆشیی لە باب و دایك و کەس و کاری کاك عومەر بۆسکێنی و کاك تاهیر مەمەنداوەیی دەکەین، لە خوای بە بەزەیی دەپاڕێینەوە ئەو قوربانیانەیان لێ قبووڵ بکات، ئەو شەهیدانەیان بۆ بە پلەی بەرز بگەیەنێت، موژدەشیان پێدەدەین، موژدە بەکەس و کاری ئەو چوار شەهیدانە دەدەین و هەر شەهیدانێکی دیکە کە لە ڕێی ئیسلامدا شەهید دەبن، کە زۆر چاك بزانن پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەفەرموێ: یەكێك لەوشتانەی کە بەشەهید دەدرێت،

(١) ئێستا بابی هەر چوار شەهیدەکە و، هەروەها دایکی هەرکام لە مامۆستا عبدالرحمن و کاك ئەحمەد شاسوار، کۆچی دواییان کردوە، خوای بەخشندە بە پلە بەرزەکانی بەهەشتیان شاد بکات.

(٢) لە دوای فلانکەسی وەبی: یانی پشتی بەربدەی و [illegible]

یەكێك لەو پاداشتانەی كە دەدرێ بە ئینسانی شەهید، ئەوەیە كە دەتوانێ شەفاعەت بۆ حەفتا(٧٠) كەس لە خزم و كەسانی خۆی بكات لە قیامەتێدا: (يشفَّعُ الشَّهيدُ في سبعينَ من أهلِ بيتِهِ) رواه أبوداود في سننه ٢٥٥٢، الجامع الصغير: ١٠٠١٢ ورمز السيوطي لحسنه.

ئنجا ئەی كەس و كاری شەهیدەكان! دڵتان نارەحەت نەبێت، ئەو شەهیدانە دەبوو هەر مردبان، مردن ڕێی هەموو كەسە، مردن ڕێیەكە هەمووكەس پێیدا دەڕوات، بەڵام مردن تاكو مردن فەرقی هەیە، كوا ئەو جاشەی كە لەپێناوی پارەدا دەڕوات، كوا ئەوكەسەی كە لەپێناوی ڕژێمدا خۆی و دینەكەی و هەموو شتێك لەدەست دەدات و، بەرەو جەهەندەم دەڕوات و، كوا ئەو كەسەی كە بەسەربەرزیی و ڕووسووریی بەرەو خوا لە شەقەی باڵ دەدا و دەفڕێ و دەكەوێتەڕێ؟!

والله بالله تالله، من لە كاتی ڕووح دەرچوونی مامۆستا (عبدالرحمن)و كاك (ئەحمەد)دا بۆخۆم لەوێ بووم، وەك ئینسانێك كە خەوی لێدەكەوێت، لەكاتی ڕووح دەرچوونەكەیاندا، زۆر بەئاسانیی، بەبێ پەلەكوتەكردن، بەبێ خۆڕاوەشاندن، بەبێ خۆڕاپسكاندن، وەك ئینسانێك كە باوشكی دێ لە كاتی خەوێ دا، یان لەكاتی لەخەو هەستانێ، بەوشێوەیە ڕووحیان دەرچوو، ئنجا هیچ تێكنەچووبوون، هەرچەندە بیستوومانە: جاشە خۆفرۆشەكان و ڕژێمی زاڵم، تەرمەكانیان دەرهێناونەوە، نازانین درۆیە، یان ڕاستە !.[1] بەڵام جەستە قەفەزێكە بۆ ڕووح، ئەوەی كە جەوهەری مرۆڤە لە تێڕوانینی ئیسلامدا، ڕووحەكەیە، ڕووحەكەش لە خزمەت خوادایە، بەدەنەكە هەرچی لێی دەكەن، لێی بكەن، گرنگ نیە.

(١) دوایی بۆمان دەركەوت كە دەرنەهێنراونەوە.

بەڵێ موژدەتان لێ بێت، کە ئەو شەهیدانە بەپلەی بەرز دەگەن ئینشائەڵڵا و شەفاعەت و تکا و ڕەجای چاکیش بۆ ئێوە لە لای خوای بەرز و مەزن دەکەن .[١]

**کۆتایی ئەو وتارەش بەچەند دوعایەك دێنین:**

خوایە! ئێمە و هەموو پێشمەرگەکانی ئیسلام بکە بەمایەی عیززەت و سەبەرزیی مسوڵمانان.

خوایە! کۆمەڵێکی وابین سەری مسوڵمانانمان پێ بەرز بێت، ئاڵای دینی تۆمان پێ شەکاوە بێت.

خوایە! کۆمەڵێکی وابین، ڕێ و شوێنی موحەممەدمان (صلى الله عليه وسلم) پێ زیندوو بێتەوە، کوردستانمان پی لەدەستی زۆرداران پاك بێتەوە، میللەتی کوردی مەزڵوممان پێ ڕزگار بکرێت، ڕژێمی عەفلەقیی و جاشە خۆفرۆشەکانمان پێ بخەسێندرێن .[٢]

---

(١) پاشان چەند ڕۆژێکی کەم دوای جەنگی قەڵاتووکان، خەونێکم بە مامۆستا (عبدالرحمن)ەوە بینی، بەمجۆرە: (لەخەودا بینیم بە ڕوویەکی گەش و دەم بە زەردەخەنەوە، لێم پرسی: کاك عبدالرحمن چۆنن؟ گوتی: هەمووومان لە بەهەشتین و خوا پلەی شەهیدیی پێداوین و، حۆریشی بەو سێ برایەمان داون، گوتم: کامەتان پلەی بەرزترە؟ بە شەرمێکەوە گوتی: هی من).
پێشم وابوو: بۆیە مامۆستا عبدالرحمن باسی (حۆریی) پێدانی خۆی نەکرد، چونکە:
١- خۆی هاوسەردار بوو و بابی سێ ڕۆڵە بوو، دوو کچ و کوڕێك.
٢- وەك شەرم و ڕێزێك نەیویست باسی هی خۆی بکات، ئەگەر نا لە حۆریی پێدراندا، شەهیدان یەکسانن. ع.ب.

(٢) مەبەست لە وشەی: خەساندن، مانا مەجازییەکەیەتی، نەك مانا ڕواڵەتییەکەی، کە تێدا نەهێشتنی پیاوەتی (رجولة)یە، چونکە ئەوە گۆڕینی دروستکراوی خوا (تغيير خلق الله)یە کە حەرامە. ع.ب.

خوایە! ئەم جیهادەمان بۆ بکە بە مایەی سڕانەوەی گوناهەکانمان، ئەم جیهادەمان بۆ بکە بەمایەی بەرزبوونەوەی پلەکانمان.

خوایە! ئەم جیهادەمان لێ قبووڵ بکە.

خوایە! زیاتر دڵمان ساغ بکەوە.

خوایە! ئەو سیفەتانەمان تێدا بێنەدی کە دەبنە هۆی سەرکەوتنمان و، لەو سیفەتانەمان بەدووربکە کە دەبنە هۆی ژێرکەوتنمان.

خوایە! دڵی مسوڵمانان بەرەو جیهاد بجۆشێنی.

خوایە! ڕقی مسوڵمانان لە کافران هەڵبستێنی.

خوایە! ڕیزی مسوڵمانان پتەوتر بکە، دڵیان زیاتر پێکەوە جۆش بدە.

خوایە! مسوڵمانان بکە بە قەڵایەکی مەحکەم بۆ ئەو میللەتە مسوڵمانە هەژارەی کورد.

خوایە! جیهادی ئیسلامیی گەشەدارتر بکە، بیکە بە قەڵایەکی مەحکەم بۆ کوردی مسوڵمانی چەوساوە.

خوایە! بە جیهادەوە بمانژیەنە و، لەژێر ئاڵای سەرکردەی جیهادکەراندا حەشرمان بکە.

خوایە! یەکێك لە دوو ئاواتەکانمان بۆ بێنەدی، یان سەرکەوتن، یان شەهیدیی.

آمين والحمد لله رب العالمين.

# پاشکۆ

زۆربـــەی وێـنـەکـان بـە کـامـیـرای بـرایـانـی پێشمەرگە

( تـەهـا حـاجـی زاهـیـر و عـبـدالـکـریـم قـــادر )

گیراون و ئەرشیف کراون، کە تایبەتن بە قۆناغی قەڵاتووکان .

وێنەکان لە یوتیوب

https://youtu.be/ouVA8xIq8ec



# بۆ شەهیدان

شەریف وەرزێر- ١٩٨٨/٨/٢٢ - قەندیل

پێشکەشە بە شەهیدانی ئیسلام بە گشتی و بە تایبەتی (مامۆستا عبدالرحمن لۆتەریی و کاك ئەحمەد شاسوار سکتانی و کاك عومەر بۆسکێنی و کاك تاهیر مەمەنداوەیی) کە لە ڕۆژی ١٩٨٨/٧/٢٢ ، لە گردی (ڕەمکان)ی ناوچەی قەڵاتووکان، لە تێکهەڵچوونێکی کەم وێنە لەگەڵ ڕژێمی بەعسی عەفلەقی دا، شەهید بوون، خوای پەروەردگار بەپلە بەرزەکانی بەهەشتیان شاد بکات.

به یاد و سۆزی شـــەهیدی ئـەم ئیسلامە، دەسا خامە!
بنووسە دەی بە قوربانـە و مەفەرموو جا لەسـەر کامـە
بە یـادی ئـەو شـەهیدانە، بجۆشێ دڵـی پڕ بـاوەڕ
بە هەق شـــەهادەت ئاواتی گشت دڵسۆزێکی ئیسلامـە
شەهیدان، شەهید بوونی(وە)[1] بە ئاشکرا ئیسپاتی کرد!
کە گیان فیدا و لەخۆبووردوون، هەڵگرانی ئەم پەیامـە
ئـاوی درەخـتـی بـــاوەڕە، خوێنی ئـاڵ و گەشی ئێوە
کە بە بێ هەبوونی باوەڕ، ژیان گەندەڵ و بێ تامە
دەك پیرۆزتان بێ شەهیدان، پلەی شەهیدیی، خۆ شەهیدیی!
پیرۆزترین دیـاریـی خـودا و بـەرزترینـی مەقامـە

(١) وە : ئێوە .

ئۆخەی كاروانـی شەهیدان لێرەش لەڕێی خوا كەوتە ڕێ!
دڵنیابن ئەی شـەهیدان، كاروانی ڕێ بـەردەوامـە
ڕێبوارانـی ڕێگای جیهاد، زۆرن وەك ئێوە ڕق ئەسـتوور
كە جێی شانازیی ئیسلام بوون، مەردی وەك ئێوە كارامە
بەڵام بۆ هەركەس كـە ڕێگای ئەم كاروانـە دەگرێتەبەر
پێویستە لەبەرچـاو بگرێ، بڕوا و سەبر و ئیستیقامـە
خـۆ مسوڵمانـی شـۆڕشگێڕ (إِحْدَى الْحُسْنَيَيْنِ)[1]ی دەوێ
چلۆن لە مـردن دەتـرسـێ، مـادام كـە مـردن ئاكامە؟!
شوكر و سوپاسی خوای دەوێ، میللەتی مسوڵمانی كورد
كە هەڵیگرت چـەكی ئیسلام، بێ ترس لەم ترس و سامە
مامۆستا و لاوی شۆڕشـگێڕ، پێشمەرگەی ئیسلامن ئێستا
ئۆخەی ئیسلام ئەمڕۆ خاوەن، پێشمەرگەی بەدەست و قامە!
هۆ شـەهیدانی خۆشـەویست! خۆ ئێوە زیندوون، نامرن!
خوا دەفەرموێ: (بَلْ أَحْيَاءٌ) [2] ئەمنیش شەهادەت هیوامە
خوایـە، ئەگەر شایانی وەم[3]، خوێنم بڕژێ لە پێناوت
شەهادەتم بە نسیب كە، پێم بەخشە ئـەم بڕوانامە

(١) ألتوبة - ٥٢ .

(٢) ال عمران - ١٦٩ .

(٣) شایانی وەم: شایستەی ئەوەم .




شەهید مامۆستا شەریف حسێن لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیر بەرەو قەڵاتووکان




مامۆستا عەلی باپیر لەگەڵ تەها حاجی زاهیر بەرەو قەڵاتووکان.




مامۆستا عەلی باپیر بەڕێوەیە بۆ قەڵاتووکان، هەرکام لە مامۆستا حسن بابکر بەماڵەوە و هەروەها شەهید مامۆستا شەریف و ژمارەیەك لە برایانی پێشمەرگە و برا کاروانچیەکانیشی لەگەڵدان




ڕیزی دواوە لە ڕاستەوە: حسن ڕەسوڵ، عبداللەی ئیعلام، عومەری ئیعلام.
ڕیزی پێشەوە لەڕاستەوە: شەریف وەرزێر، شەهید ابراهیم عبدالله
شێخاودەلی(خاڵ برایم) خەریکی خاوێنکردنەوەی کانیین .




داربڕین بۆ زستان و خانووكردن




مامۆستا عەلی باپیر، لەكاتی خوێندنەوە و نووسیندا لای ماڵی خۆیان




مامۆستا عەلی باپیر، شەهید: ئەحمەد شاسوار، منداڵەکە: محمدی کوڕی مامۆستا عەلی باپیر




وەرگرتنی بەیعەت، لە ڕاستەوە: شەعید عەلی دێرەیی، عبدالکریم قادر، عومەر شەمسەدین، مامۆستا عەلی باپیر




**هێزی حەمزە**

**ڕیزی دواوە لە ڕاستەوە: (شەهید فەقێ حسن نەبیە سوور ماخۆبزنی – کاروانچی، م.هێواش، عبدالواحید باپیر، حسن بۆسکێنی، شەهید: خاڵ برایم شێخاودەلی، بێستون شێخاودەلی، م.حسن علی بۆسکێنی، عومەر شەمسەدین، شەریف وەرزێر)**

**ڕیزی پێشەوە لە ڕاستەوە: (شەهید مامۆستا عبدالرحمن لۆتەریی، عبدالرئوف کانی تووبی، علی بچکۆل، شەهید: فەقێ برایم دوگۆمی، فەقێ عبدالفتاح، حەمە ڕەشی ڕەحمەتی).**




ژمارەیەك لە برایانی كاروانچی لە ڕاستەوە:
شەهید فەقێ حسن نبی ماخۆبزنی، فەقێ محمود، عبدالله ئەحمەدخان




ژمارەیەك لە برایانی كاروانچی لە ڕاستەوە: (عبدالله ئەحمەدخان، فەقێ محمود، شەهید: فەقێ حسن نبی ماخۆبزنی)، مامۆستا حسن بابەكر و زانای كوڕی




كاك تەهای حاجی زاهیر تۆقە لەگەڵ شەهید: فەقێ حسن نبی ماخۆبزنی دەكات.




مامۆستا عەلی باپیر بەبۆنەی گەڕانەوەی بەشێك لە هێزەكانی بزووتنەوە لە قەرەداغەوە بۆ قەڵاتووكان، وتارێك پێشكەش دەكات.




ڕیزی دواوە لە ڕاستەوە: حسن ڕەسوڵ، ئومێد بۆسکێنی، م.حسن عەلی، مەحمود ڕێباز، شەهید عەلی دێرەیی، م.عبداللە خورخورەیی.
ڕیزی پێشەوە لە ڕاستەوە: م.کمال محمد بۆسکێنی، شەهید خدر بۆسکێنی.




ڕیزی دواوە لە ڕاستەوە: عبداللەی ئیعلام، شەهید عەلی دێرەیی، شەریف وەرزێر، ئارام خەلیل.
ڕیزی پێشەوە لە ڕاستەوە: شەهید ابراهیم عبداللە (خاڵ برایم)، محمود ڕێباز، شەهید خدر بۆسکێنی، حسن بۆسکێنی، بێستوون شێخاودەلی، بیلال بۆسکێنی و فەرەیدونی کوڕی.




مامۆستا شێخ عبداللطیف واژەیی و مامۆستا عەلی باپیر و مامۆستا ئەبوبەکری صدیقی و مامۆستا حەسەن بابەکر و کاك محمد عزیز، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی هێزەکانی حەمزە و بەشێك لەو پێشمەرگانەی لە قەرەداغەوە گەڕابوونەوە




مامۆستا مەلا عەلی مەمکی لە پێشەوەیە



١٩٨٨/٧/٢٠ قەڵانووکان
گردی ڕەمکان بەدیوی
کانی گاتوان(ن)دا

مامۆستا عەلی باپیر و شەهید مامۆستا عبدالرحمن لۆتەریی لەکاتی بۆسەکەدا



١٩٨٨
سەرگردی ڕەمکان

شەهید عمر بۆسکێنی لە پێشەوە دانیشتوە




لە ڕاستەوە: ڕەسوڵ شێخاودەلی، مامۆستا مەلا عەلی مەمکی، محمد بابکر.




شەهید ئەحمەد شاسوار، فەقێ عبدالفتاح




دەستەیەك لە پێشمەرگەكانی هێزەكانی حەمزە و حسن البنا و نەصر، لەڕاستەوە:

كاك صاڵح (بیلال هەڵەبجەیی)
جەمیل كاكەمین هەمزە (هەواری)
عوسمان سلیم محمد (شەریف وەرزێر)
عبدالرحمن حسین محمدامین (هێرش مەمەنداوەیی)
تەها حاجی زاهیر
ابراهیم عبدالله اسماعیل (بێستوون شێخاودەلی)
كاك تەیب (عەبدوڕڕەحمان)




شەهید مامۆستا جمال احمد شارباژێڕی، حاجی سەعیدی ڕەحمەتی




عبدالکریم قادر، مامۆستا ابوبکری صدیقی




، لەڕاستەوە: شەهید احمد شاسوار،مامۆستا حسن بابکر، عبداللە ئیعلام،

منداڵەکە زانا حسن بابکر




لە ڕاستەوە: محمد عزیز، محمد سیروان، عەلی قوربانی



مانگی ٨ی ١٩٨٨
خڕندۆڵ/ قەندیل

دەستەیەك لە پێشمەرگەكانی هێزەكانی حەمزە،
كاك محمد عزیز – ی هێزی فاروق یان لەنێودایە



مانگی ٨ی ١٩٨٨
خڕندۆڵ/ قەندیل

لەراستەوە: محمد عزیز، عبدالباقی رسوڵ، محمود ڕێباز، عبدالكریم قادر،
م.كمال محمد بۆسكێنی، بێستون شێخاوەڵی، عمر شێوەڕەزی




دەستەیەك لە پێشمەرگەكانی هێزەكانی حەمزە،
مامۆستا محمد زەرزی یان لە نێودایە




**پیاوەکان لە ڕاستەوە:**

مامۆستا عەلی باپیر، مامۆستا سەید عبداللە لۆتەری، بیلال بۆسکێنی.

**ئافرەتەکان:**

داك مەلاژنە ڕووخساری ڕەحمەتی هاوسەری مامۆستا عەلی باپیر و منداڵەکانی .

فاتمەخان هاوسەری ملا احمدی هەنارۆکی.

دوو ئافرەتی ڕەوەند، پیرۆزخان هاوسەری بیلال بۆسکێنی.

ئایشەخان هاوسەری مامۆستا سید عبداللە لۆتەری.

شلێرخان هاوسەری شەهید مامۆستا شەریف.

١٩٨٨/٨/١١
قەندیل



١٩٨٨/٨/١٢
قەندیل

دەستەیەك لە فەرماندە وپێشمەرگەكانی هێزەكانی حەمزە و ئازادی و شافیعی، مامۆستا عبدالقادری برایەتییان لە نێودایە




دەستەیەك لە پێشمەرگەكانی هێزەكانی حەمزە و ئازادی و شافیعی




دەستەیەك لە پێشمەرگەكانی هێزەكانی حەمزە و شافیعی




مامۆستا عەلی باپیر لەنێو دەستەیەك لە فەرماندە و پێشمەرگاكانی هێزەكانی حەمزە و ئازادی دایە.




لە ڕاستەوە: محمد حسن موسڵاوی، شەهید: مامۆستا مغدید حسێن، شەهید: مامۆستا ئەحمەد سینەمۆکی.




دەستەیەك لە پێشمەرگەكانی هێزەكانی حەمزە

لە ڕاستەوە: سۆركان حەمەد – ی ڕەحمەتی، مام جەوهەر، شەهید محمد بەستەستێنی، دانا زوودی.




لە ڕاستەوە: م.محمود هێرۆیی، شوان سلێمانی، م.عباس حسێن ڕۆستەم، عبدالکریم قادر، خاڵ هەڵمەت




مامۆستا عەلی باپیر، تەها حاجی زاهیر، مامۆستا محمدی زەرزی




لە ڕاستەوە: باوەڕ دواوەیی، محمود ڕێباز، خالید شێخە




لە ڕاستەوە: تاریق سلیم (ئارام)، عبدالباقی رسوڵ، شەهید عەلی دێرەیی



مانگی ٨ی ١٩٨٨
شێخ ئایش/ قەندیل

لە ڕاستەوە: مام خدر،  عیزەدین محمد عمر (حاجی ڕزگار).



کوێستانی مالێخ، قەندیل ١٩٨٨/٨/٢٠

داک مەلاژنە ڕووخساری ڕەحمەتی هاوسەری مامۆستا عەلی باپیر و منداڵەکانی، لەگەڵ خێزانی چەند برایەکی پێشمەرگە و چەند ئافرەتێکی ڕەوەند.



گۆڕی شەهید تاهیر عبدالله مەمەنداوەیی، کە لای مقەڕی یەکی ئەوکاتی هێز لەنێو قەڵاتووکان نێژراوە



گۆڕی شەهیدان: مامۆستا عبدالرحمن لۆتەری و ئەحمەد شاسوار سکتانی و عومەر بۆسکێنی) لەسەر گردی ڕەمکان، کە بەیەکەوە و لەنێو یەک گۆڕدا نێژراون و تەنها بۆ ناسینەوە کێلەکان بەو شێوەیە دانراون

# یاد و بیرەوەری داستانی قەڵاتووکان و شەهیدانی گردی ڕەمکان

سوپاس بۆ خوا بە پێی هەل و مەرج و قۆناغەکان، نیوەنیوە و بە شێوازی جیاجیا، بە بەرنامەی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنیی، کۆڕ، یاخود سەردانی گۆڕی شەهیدەکان، یادی داستانی قەڵاتووکان و شەهیدانی گردی ڕەمکان کراوەتەوە، بۆ نموونە:

١- ٢٠١٣/٧/٨ سەردانێکی مەیدانییمان بەبەشداری ژمارەیەکی زۆر لە فەرماندە و پێشمەرگە دێرینەکان و کەس و کاری شەهیدان و تیمی کەناڵی ئاسمانی پەیام و مەڵبەندی (٥)ی ڕانیەی کۆمەڵ، بۆ قەڵاتووکان ئەنجامدا و، بەرنامەیەکی سێ ئەڵقەییمان لەسەر داستانەکە و شەهیدە ئازیزەکان بۆ کەناڵی پەیام ئامادەکرد، کەتێیدا وتەی مامۆستا عەلی باپیر فەرماندەی ئەوکاتی هێزەکە و ژمارەیەك لە فەرماندە و پێشمەرگە دێرینەکان و کەس و کاری شەهیدانمان وەرگرتبوو و ژیاننامەی شەهیدەکانیشمان تێدا پێشکەش کردبوو، شایانی باسە بۆ ئەم سەردان و بەرنامەیە، یەکەمین جار لە ٢٠١٣/٦/١٩ چووین، بەڵام بەداخەوە لە (دۆڵی سێوەیس) سەرەڕای ئاگادارکرانەوە و تەنسیقیش لەگەڵیاندا، هێزەکانی یەکەکە ڕێگریان لێکردین و نەیانهێشت ئەرکەکەمان جێ بەجێ بکەین و سەردانەکەمان ئەنجام بدەین، هەرچەندە زۆرمان لەگەڵ گوتن و ڕوونکردنەوەمان بۆ دان، بەڵام

نەیان بیست و ناچار بەنیگەرانی قوڵ و سەرسوڕمانی زۆرەوە، گەڕاینەوە، تا ئەوەبوو جاری دووەم تێهەڵچووینەوە و لە ٢٠١٣/٧/٨ سەفەرەکەمان ئەنجامدا!

دیارە هەردوو وێنەی گۆڕی شەهیدەکانیش، ئی ئەو سەفەرەن.

٢- لە ٢٠١٩/٧/٢٢ مەڕاسیمێکی تایبەت بە ئامادەبوونی مامۆستا عەلی باپیر و کەس و کاری شەهیدانی گردی ڕەمکان و ژمارەیەکی زۆر لە خانەوادەی شەهیدانی سنوورەکە و پێشمەرگە دێرینەکان، بەسەرپەرشتی مەڵبەندی ڕانیەی کۆمەڵ، لە هۆڵی شەهید کۆساری لە ڕانیە سازدرا، تێیدا وێڕای وتەی لیژنەی ئامادەکار و وتاری مامۆستا عەلی باپیر و وتەی بنەماڵەی شەهیدانی قەڵاتووکان و شیعر و سروود،خەڵاتی ڕێزلێنانیش لەلایەن مامۆستا عەلی باپیرەوە پێشکەش بە خانەوادەی هەر چوار شەهیدەکە کرا.



# کورتەیەك لە مێژووی ژیانی مامۆستا عەلی باپیر

- ناو: عـــەلی بـــاپیـــر وەتمـان .
- لـــەدایکبووی: ســالّی (١٩٦١ز)دا لـەقــەزای پشـــدەر سەر بەپارێزگای سلێمانیی.
- زانیارییە ئیسلامییەکانی لە پەیمانگای ئیسلامیی (ڕانیەو سلێمانیی)و لە لای زانایانی کوردستانی عێـراقو "دواتـریش کوردسـتانی ئێـران" بەدەسـتهێناون، لەسـالّی (١٩٨٠ز)دا قورئانی بەپیزی لەبەر کردوە.
- لەسالّی (١٩٨١ز)دا لەلایەن ڕژێمـی بەعسـەوە بڕیـاری دەسـتگیرکردنی دراوە، هەربۆیە ئەوکات عێراقی جێهێشتوەو ئاوارەی ئێران بووە، کە ئەوکاتە لـە قۆنـاغی دووەمی زانکۆ بووە، کۆلیجی شەریعەت.
- لەسالّی (١٩٨٣ز)دا گەڕاوەتەوە کوردستانی عێڕاقو لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقاف هەولێر تاقیکردنەوەی ئیمامەتی داوەو، لە مزگـەوتی (نۆڕسـیی) لـە شـاری ڕانیـە دامەزراوەو، بەردەوام بووە لەسەر دەرس گوتنەوەو بانگەوازی ئیسلامیی‌و...هتد.
- یەکەمین بەرهەمی لەسالّی: (١٩٨٣)زدا نووسیوە بەناوی: (پوختەیـەك دەربـارەی ئیسلام) پاشان کتێبو بەرهەمەکانی بەردەوام بـوون کـە ئێسـتا ژمارەیـان لەسـەد (١٠٠) تێپەڕیوە، لە مەوسووعەو کتێبو ناميلکەو، بەزمانی کوردیی‌و عەرەبیی‌و، هەنـدێك لـە کتێبەکانیشـی کـە بـەزمانی کـوردیی نووسـیونی، بـۆ زمانـەکانی: عەرەبیی‌و، فارسیی‌و، تورکیی‌و، ئینگلیزییش وەرگێڕاون.
- لەسالّی (١٩٨٧ز)دا پاش سالآنێك لە خەباتی ئاشکراو نهێنیی پەیوەسـت لـەگـەلّ {بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی}دا، کە لەکۆتایی حەفتایەکانی سەدەی پێشوودا ڕێکخستنە نهێنییەکانی دامەزران، چۆتە چێوەدەسی بەخەباتی چەکداریی کـردوە

لە چوارچێوەی بزووتنەوەی ئیسلامییدا، کە لەچەند ناوچەیەکی کوردستاندا بنکەو بارەگای سەربازیی هەبوو دژی ڕژێمی بەعس‌و، هێزی حەمزەی لە بناری چیای قەندیل دامەزراند.

- لە ساڵی (١٩٨٨ز)دا بووە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بزووتنەوەی ئیسلامیی.
- لەساڵی (١٩٩١ز)دا ڕۆڵی هەبووە لەڕاپەڕینی ئازاری (١٩٩١ز)داو وریاکردنەوەی خەڵکی کوردستان، لە مەبەست‌و ئامانجەکانی ڕاپەڕینی جەماوەریی‌و ناساندنی بزووتنەوەی ئیسلامییدا.
- تاکو ساڵی (٢٠٠١ز) لەنێو بزووتنەوەدا درێژەی بەخەباتی خۆی داوەو، لەهەمان ساڵدا لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری هێزو مەڵبەندەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەبەر چەند هۆکارێکی مەنهەجیی (کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان) ڕاگەیانراو بەئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵبژێردرا.
- لە (٢٠٠٣/٧/١٠ز) لەسنووری سلێمانیی لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە بەتۆمەتی نارەوا دەستگیرکراو، بۆ ماوەی (٢٢) مانگ لەزینداندا مایەوەو، هەر لەزینداندا مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلي في كتاب الله)ی لە دوازدە کتێب‌و زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەدا نووسییو، لە (٢٠٠٥/٤/٢٨ز)دا لەزیندان ڕزگاری بوو.
- تا ئێستا زیاتر لە (١٠٠) بەرهەمی هەیە لە: مەوسووعەو کتێب‌و نامیلکە، لەبوارەکانی: (فیکری ئیسلامیی‌و عەقیدەو فیقهو حوکم‌و سیاسەت‌و تەزکیەی نەفس‌و ئەخلاق‌و، بەرپەرچدانەوەی بیرو ڕێچکە نامۆیەکان‌و...هتددا.
- لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠١٠-٢٠١٤ز)دا، بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەسەر بازنەی پارێزگای هەولێر کاندید بووەو، دەنگی یەکەمی هێناوە، زیاتر لە (٦٠،٠٠٠) دەنگ.
- کۆمەڵی ئیسلامیی تائێستا سێ کۆنگرەی بەستوە، لەساڵانی: (٢٠٠٥ و ٢٠١٠ و ٢٠١٥ز)داو، لەهەموویاندا، بەئەمیر هەڵبژێردراوەتەوە.
- ئێستا پڕۆژەی تەفسیرکردنی قورئانی بەرزو بەپێزی دەستپێکردوەو، تا ئێستا چەند بەرگێکی لێ چاپ‌و بڵاوکراوەتەوە.

بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ژیانی دانەر، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:

www.alibapir.net

www.alibapir.net

# بەرهەمەکانی

# مامۆستا عەلی باپـــیر

## أ / کتێبە کوردییەکان

## قـــورئـــانو ســـونـــنـەت

| ژ | کتێبەکان | بەرواروچاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 1 | پوختەیـەك دەربـارەی ئیسـلام لەبـــەر ڕۆشـــنایی ســـورەتی فاتیحەدا | چـاپی یـەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| 2 | بـا لـە خزمـەت قورئانـدا بـین، {کۆی هـەردووك کتـێبی: (چۆن باشـتر لـە قورئـان بەهرەمەنـد دەبـین؟)و (ئـەرکی سەرشـانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چـاپی یـەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| 3 | تەفسـیـری قورئـانی بـەرزو بــەپێز، بــەرگی یەکــەم: سوورەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| 4 | تەفسـیـری قورئـانی بـەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 5 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| 6 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| 7 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| 8 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم : سوورەتی: (الأعراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| 9 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| 10 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |
| 11 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| 12 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دەیەم: سوورەتی: (هود) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 13 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سوورەتی: (يوسف) | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| 14 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دوازدەیەم: سوورەتەكانی: (الرعد، إبراهيم، الحجر) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| 15 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێزدەیەم: سوورەتی: (النحل) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| 16 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چواردەیەم: سوورەتی: (الإسراء) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| 17 | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پازدەیەم: سوورەتەكانی: (الكهف، مريم) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| 18 | شوێنكەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لەنێوان كەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| 19 | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسەو گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |

# بیروبڕواو فیكری ئیسلامیی

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 20 | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلامو ڕێچكان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| 21 | ڕێبازی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم كامەیە ؟! | چاپی یەك<br>١٩٨٩/ | دواتر خرایە ناو كتێبی (موسڵمانی كامڵ: بەشی یەكەم: بیروباوەڕی موسڵمان) |
| 22 | پڕۆژەی بەرنامەی پەروەردەو فێركردنی ئیسلامییانە | چاپی یەك<br>١٩٩٥/ | دواتر خرایە ناو كتێبی: (پڕۆژەی بەرنامەی فیكریی كاری ئیسلامیی) |
| 23 | پڕۆژەی بەرنامەی فیكریی كاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| 24 | بنەما شەرعییەكانو هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی چوار<br>٢٠١٤/ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| 25 | چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم، سەرنجێكی واقیعیانەو هەڵسەنگاندنێكی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی شەش/<br>٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبیو توركیو فارسییش |
| 26 | خواناسیی، ئایین، ئیمان (درەوشاوەیی ئیسلامو پووچەڵیی ئیلحاد) | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی سێ/٢٠٢٠ | |
| 27 | ناوە هەرەجوانەكانی خوا "سبحانه وتعالی" | چاپی یەك/ ٢٠١٣ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | **مەوسووعەی : ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ)** | چاپی یەك/ ٢٠٠٦-٢٠٠٨ چاپی دوو/٢٠١٦ | |
| 28 | بەرگی یەکەم: ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| 29 | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |
| 30 | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەتو لەپەرستراوێتییدا | | |
| 31 | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| 32 | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | | - |
| 33 | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەکانی پەیڕەوانی ڕێبازی ڕاست | | |
| 34 | مسوڵمانی کامڵ : بەشی یەکەم : بیروباوەڕی مسوڵمان | چاپی یەك /١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا) |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 35 | تـەوژمی ئیسـلامیی‌و عـەلمانیی‌و خاڵە هاوبەش‌و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چـاپی سێ<br>٢٠١٥/ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقـە لە هەفتەنـامەی (هـاوڵاتی)دا، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| 36 | ڕوونکردنـــــەوەی بنــــەما شەرعییەکان‌و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| 37 | تەرجەمـەی کـوردیی عەقیـدەی طـەحاویی | چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| 38 | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحـاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| 39 | ســـیکۆلاریزم‌و دیموکڕاســـیی لەئـــەزموونی کوردســـتاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبیی‌و، شێوەزاری کرمانجیی |
| 40 | درەوشـاوەیی ئیمـان‌و پووچـەڵیی ئیلحـاد، لەبـەر ڕۆشـنایی زگمـاك‌و عەقڵ‌و زانست‌و وەحییدا | چاپی یەك/٢٠١٩<br>چاپی دوو/٢٠٢٠ | |
| | **مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی‌و واقیعدا** | | - |
| 41 | کتێبی یەکەم: پێناسـەو چـییەت‌و سـەر گوزشـتەو سەرچـاوەکان‌و گرنگیی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | - |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 42 | کتێبی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | - |
| 43 | کتێبی سێیەم: تەوژمە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| 44 | کتێبی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٩ | - |
| 45 | کتێبی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | چاپی یەك/٢٠١٩ | - |
| | زنجیرەی: باچاکتر ئیسلام بناسین! | | ئەم سێ ئاڵقەیە: دوایی خرانە نێو مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە |
| 46 | ئاڵقەی یەکەم: سەلماندنی بوونی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | - |
| 47 | ئاڵقەی دووەم: پێغەمبەران "علیهم الصلاه والسلام" | چاپی یەك/١٩٨٩<br>چاپی دوو/١٩٩٠ | - |
| 48 | ئاڵقەی سێیەم: ڕۆژی دوایی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| 49 | ئاڵقەی چوارەم: ئایین | | دوایی خرایە نێو کتێبی: (خواناسیی, ئایین, ئیمان) |
| 50 | بیرو بڕوا | چاپی یەك/١٩٩٠ | |

## فیقهی ئیسلامی

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | **مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی (٤ بەرگ)** | چاپی یەك/٢٠٠٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| 51 | بەرگی یەكەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەكان، پاكو خاوێنیی | | |
| 52 | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاكردن یەكەمین درووشمی خواپەرستیی | | |
| 53 | بەرگی سێیەم: زەكاتو ماڵ بەخشین | | |
| 54 | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەجو عومرەكردن، زیكری خواكردن | | |
| 55 | بنچینە گرنگەكانی هەڵسوكەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەكاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| 56 | جەژن و یادو بۆنەكانو هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| 57 | چەند بابەتێكی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە كراوە |
| 58 | چەند بنەمایەكی گرنگی ماڵو سامان بەخشین لەڕێی خوادا | چاپی یەك/٢٠١٣ | |

# تەزکیـەی نەفس و ڕەوشت و ئاکـار

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 59 | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | چاپی یەك/١٩٨٧ | |
| 60 | ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی پێنج/٢٠١٢ | وەرگێردراوە بۆ زمانی عەرەبیو فارسییش |
| 61 | تەزکیەو تەبایی‌و، یەکڕیزیی‌و برایی | چاپی یەك/١٩٩٨ | |
| 62 | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | |
| 63 | گەڕانەوە بۆ لای خوا (سبحانه وتعالی)، بەرەو خوا وەرچەرخانو، وازهێنان لە گوناه و سەرپێچیی‌و، گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی پێنج/٢٠١٠ | |
| 64 | شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! | چاپی یەك/٢٠٠٢ | |
| 65 | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزنەوە، لەدنیاو دواڕۆژدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| 66 | گیانی ژیان: باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك كردن | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| 67 | مەوسووعەی: ڕەوشتو ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| 68 | ئەدەبو ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان لەبەر ڕۆشنایی وەحیی‌و عەقڵدا | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |

## بانگەوازو کاری ئیسلامیی

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 69 | کۆمەڵی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | |
| 70 | پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسولْمانی موجاهید کێیەو چۆنە؟ | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی چوار/٢٠٢٠ | |
| 71 | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| 72 | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مانو نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |
| 73 | بزووتنەوەی ئیسلامیی و قۆناغی نوێی | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| 74 | تێگەیشتن | چاپی یەك/ ١٩٩٦ | |
| 75 | چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| 76 | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەکی گەش و ڕوون، بنەما شەرعییەکان و بنچینە ئەخلاقییەکان | چاپی یەك/ ١٩٩٧ | |
| 77 | ئیسلامو کێشە هەنووکەیی یەکان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| 78 | زانایانی ئیسلام کێنو چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| 79 | کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| 80 | هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی دا و، چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەندام و موجاهیدانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| 81 | چۆن لە جیهاد تێبگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| 82 | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| 83 | جیهاد لەڕێی خوادا/ بۆ ئەوەی بەهەڵە لەجیهاد تێنەگەین و لەسەر جەنگ کردنمان قەرزدار نەبینەوە | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| 84 | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |
| 85 | چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| 86 | ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| 87 | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چـاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| 88 | بەشداریی‌کردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە:<br>**ئاڵقەی یەکەم:**<br>بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریی‌کردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>**ئاڵقەی دووەم :**<br>بەڵگەکانی ڕەوایی بەشداریی‌کردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| 89 | هەڵوەشـــاندنەوەی بیـــروڕاو ڕەفتـــارە پەڕگیـــرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی |
| 90 | بـــا لادانو تـــاوانی پـــەڕگیران، بەرانبـەر بـە ئیسـلام نەمانخاتـە دوودڵیی‌و گومان | چاپی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی |
| 91 | پەڕگیـــــــریی: پێناســـــەی، نیشـــانەکانی پەڕگیـــــران، هۆکارەکـــــانی پـــــەڕگیریی، شـــوێنەوارو دەرهاویشـــتەکانی، چارەسـەری | چـاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| 92 | هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی | چـاپی یەك/ ٢٠١٩ | |

## زنجیرەی
## بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 93 | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| 94 | ئاڵقەی دووەمو سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی موسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| 95 | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبوو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێردراوەتە سەر زمانی عەرەبیی |
| 96 | چۆن گەشە بە کۆمەڵی ئیسلامیی بدەین؟ | چاپی یەك / ٢٠٢٠ | |

## وتاری
## کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 97 | کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| 98 | راپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| 99 | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمانو واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |

## نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 100 | کوردستان بۆ وێران بووو چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| 101 | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| 102 | سۆزی نەتەوایەتییو بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی سێ/٢٠٠٥<br>چاپی چوار/ [illegible] | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 103 | چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمانو پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| 104 | چەند ڕێنموویيەك بۆ حاڵەتی ئیسلامیی لە کوردستاندا | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| 105 | جەژنی قوربانو جەنگی قەڵاتووکان | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |

## سیاسەت و حوکمڕانیی

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 106 | چەند بابەتێکی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵو وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | **مەوسووعەی: ئیسلامو دەوڵەتداریی، (٤ بەرگ)** | چاپی یەك / ٢٠١٤ | |
| 107 | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشتو بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| 108 | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 109 | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان): یاسادانان جێبەجێکردن، دادوەریی | | |
| 110 | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| 111 | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| 112 | قورئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| 113 | گرنگیی ڕەوشت لەسیاسەتدا | چاپی یەك/ ٢٠١٩<br>چاپی دوو/٢٠١٩ | |

## ئافرەت و خێزان

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 114 | ئافرەتی مسوڵمانی کورد، مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی | چاپی یەك / ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٣ | |
| 115 | مەوسووعەی : ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چاپی سێ/٢٠١٣ | |

## مـێــــــــژوو

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| 116 | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، دەرس و پەندەکانی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| 117 | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| 118 | بەرکولێکی کاروچالاکیی و رووداوەکانی ژیانم (١٩٦١-٢٠١٧) | چاپی یەك/٢٠١٨ | بۆ هەردوو زمانی عەرەبیی و ئینگلیزیی وەرگێردراوە |

## دیدارو گفتوگۆ

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| 119 | سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | - |
| 120 | ئەشکەنجەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیستو دوو مانگ لە زیندانی داگیرکەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپو بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە |
| 121 | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك/ ٢٠١٠ | |

## زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 122 | گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی‌و لاسایی کردنەوەدا(١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| 123 | با وریا بین ! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| 124 | بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەکەین؟!(٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | - |
| 125 | چۆنیەتی بوونە پێشەنگ‌و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| 126 | سیاسەتی ئیسلامیی‌و چەند ڕوونکردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| 127 | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی(٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| 128 | قوتابیانی زانیاری شەرعیی‌و چەند سەرنج‌و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| 129 | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە(٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| 130 | بانگەواز بۆ لای خودا چی یەو چۆنەو بە کێ دەکری؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| 131 | قوتابیان لەم هەل‌و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن‌و چی بکەن؟!(١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 132 | واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| 133 | سروشت‌و پایەکانی خێزان‌و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع‌و عەقڵدا (١٢) | چاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| 134 | کاری ئیسلامیی‌و ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| 135 | حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| 136 | مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی‌و چەند سەرنجێك(١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| 137 | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون‌و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| 138 | تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| 139 | ڕەوەندی کورد لە هەندەران‌و ئەرکی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| 140 | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە(١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| 141 | گەنج‌و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| 142 | ژیان لەسایەی ئیماندا‌و ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |

## ب/كـتـێـبـە عـەرەبـیـەكـان

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 143 | **موسوعة :**<br>**الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله** | ط الاولى/٢٠١٥ | |
| 144 | كە لە چاپی یەكەمدا (٨) بەرگە‌و، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) كتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: | | |
| 145 | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| 146 | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| 147 | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| 148 | الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة و بالجن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| 149 | الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| 150 | الكتاب السادس: الإيمان برسل الله تعالى وأنبيائه الكرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| 151 | الكتاب السابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سيرته وبراهين نبوّته | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| 152 | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | ط الثانية/٢٠١٨ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 153 | الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| 154 | الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى | ط الثانية/٢٠١٩ | |
| 155 | الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| 156 | الكتاب الثاني عشر: الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| 157 | نقض فكرة التطرف | ط الاولى/٢٠١٦-لندن، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض افكار المتطرفين) | |
| 158 | ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية) | ط الاولى/٢٠٠٦ | - |
| 159 | لقاء خاص (مقابلة مع قناة العالم) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |
| 160 | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الاولى /٢٠١٦ | |
| 161 | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الاولى/٢٠١٢ | |
| 162 | أمير وراء القضبان | ط الاولى/ ٢٠٠٩ ط الثاني/٢٠١٣ | |
| 163 | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |

| ژ | كتێبەكان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| 164 | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الاولى/ ٢٠١١ | |
| 165 | علماء الإسلام: أوصافهم النبيلة، وظائفهم الثقيلة، مواقفهم الجليلة | ط الاولى/ ٢٠٠٥ ط الثالثة/ ٢٠٢٠ | |
| 166 | الأصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/٢٠٠١ ط الثالثة/ ٢٠١٢ | |
| 167 | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| 168 | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الاولى والثانية/٢٠١٨ | |
| 169 | الديموقراطية والعلمانية في تجربة كوردستان | ط الأولى/ ٢٠١٧ | |
| 170 | خلاصة أحداث حياتي ونشاطاتي الفكرية والسياسية (١٩٦١-٢٠١٧) | ط الأولى/ ٢٠١٨ | |
| 171 | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | ط الأولى/ ٢٠١٨ | |

## نەو كتێبانەی لەژێر چاپن

# ناوەرۆك




ئەم وتارە هەڵقوڵاوی نێو جەرگەی خەبات و بەرخۆدان و فیداکاریی و، دەرهاویشتەی واقیعێکی یەکجار سەخت و دژوارە و، پاش شەڕێکی گەرم و خوێناویی دراوە، کە چوار برای هەڵکەوتووی تێدا کوژراون - خوا بە شەهیدی وەرگرتبن - و ژمارەیەکیش بریندار، بۆیە زمان و تەعبیری بێژرانەکەی دڵگەرمیی و حەماسەت و تووڕەییەکی بەرچاوی پێوە دیارە و، لە حاڵەتی واشدا هەر وتاری وا دەدرێ!

وێڕای ئەوەی کە زیاتر لە سی و یەك (٣١) ساڵ بەسەر ئەوکاتەدا تێپەڕیوە کە وتارەکەی تێدا دراوە و، پێویستە ئەوەش لەبەرچاو بگیرێ